





# هۆکارەکانی ملکەچ بوون لە نوێژدا



نووسینی

محمد بن صالح المنجد

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

کاروان ڕەشید محی الدین

د. سید احمد عبدالوهاب پێشەکی بۆ نووسیوە

ئاراس

| | |
|---|---|
| نــــــاوی کتێــــــب | هۆکارەکانی ملکەچ بوون لە نوێژدا |
| نووســــــــــــینی | محمد بن صالح المنجد |
| وەرگێــــڕانو ئامــــادەکردن | کاروان ڕەشید محی الدین |
| پێـــــــــــشەکی | ڕیاز کاکە محمود |
| نەخــــشەسازی نــــاوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نــــۆرەو ســــاڵی چـــاپ | دووەم ٢٠١٢ز |
| ژمــــــارەی ســــپاردن | ژمارە سپاردنی (١٢٢٨)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە |

نارین

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤

# هۆکارەکانی ملکەچ بوون لە نوێژدا

نووسینی

محمد بن صالح المنجد

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

کاروان ڕەشید محی الدین

د. سید احمد عبدالوهاب پێشەکی بۆ نووسیوە

نارین

# پەیڤێك سەبارەت بە ملكەچی لە نوێژدا

## بسم الله و به نستعين

الحمد لله الذي جعل الصلاة عماد الدين، والصلاة والسلام على من لا نبى بعده محمد بن عبدالله (ﷺ) الذى بلغ الرسالة وأدّ الأمانة ونصح الأمّة وجاهد في الله حق جهاده، ونحن على ذلك من الشاهدين، وعلى آله وأصحابه اجمعين وبعد....

دیاردەیەك لەناو زۆرێك لە موسڵمانانداد بە ڕوونی دەبینرێت، ئەویش گازندەیەکەو، هەریەك لە ئێمە ڕۆژانە لە خۆمانی دەکەین، کە بریتیە لە کەمی ملکەچی وخۆبەکەم زانین و تێڕامان و بیرکردنەوە لەناو نوێژەکانماندا، بەدڵنیاییەوە نەبوونی ملکەچی لە نوێژدا، هۆکارێکی سەرەکیە بە هۆیەوە نوێژ خوێن ناتوانێت تام و چێژ لەو بەندایەتیە گەورەیە وەربگرێت، هەروەك نەمان و هەڵگیرانی ملکەچی و بیرکردنەوەو تێڕامان لە نوێژەکانماندا دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵ بوونمان بە ماددەو ژیانی دونیاوە کە دڵمانی داگیر کردووە..! ئەمەش پاڵنەرە تا نوێژ وەك خو و (عادەتێك) سەیر بکەین کە جەستە پێی هەڵدەستێتو سەرەنجام کەمترین چێژی دەروونی لەو نوێژە وەردەگرین..! چونکە دڵ لە نوێژەکە بێ ئاگایە ، وە دڵ کاتێك دەگەڕێتەوە بارە ئاسایی و تەندروستەکەی خۆی کە لەگەڵ دابەستنی نوێژدا دڵ خۆی خاڵی بکاتەوە لە هەموو کێشە دونیاییەکان و بە تەنها

ئاگای لەلای نوێژەکەی بێت، ئەگەر بەو ڕۆحیەتەوە نوێژمان ئەنجام دا، ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە تام و چێژی دەروونی لە نوێژەکە وەردەگرین، ئەو کەسانەی بەو شێوازە نوێژ ئەنجام دەدەن هیچ کات لە نوێژ کردن بێ تاقەت نابن ،بەڵکو بەپێچەوانەوە لەگەڵ ئەنجامدانی هەر نوێژێکدا بەردەوام لە چاوەڕووانیدان تا کاتی نوێژێکی تر بێتە پێشەوەو دووبارە بچنەوە خزمەتی پەروەردگاریان.

بێ گومان هەرکەسێك بە خشووع و مل کەچیەوە نوێژ ئەنجام بدات هیچ کات بێزاری ڕووی تێ ناکات؟ چونکە لەوە تێگەیشتووە کە نوێژکردن واتای گفتوگۆو موناجات دەگەیەنێت لەگەڵ زاتی پیرۆزی خوادا، نوێژ بۆ نوێژ خوێنە ڕاستەقینەکان وەك نموونەی کەسێکی تینوو وەهایە کە ئاوی سوێر بخواتەوە، هەتا ئاوی زیاتر بخواتەوە زیاتر تینویەتی ڕووی تێ دەکات، وەك عوسمانی کوڕی عەففان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: (لوطهرت قلوبکم ماشبعت من کلام الله ، وما أحب أن يأْتي عليّ يومٌ وليلة اِلاّ أنظر في كلامِ الله).

واتە: ئەگەردڵەکان پاك دەبوون ئەوا هەرگیزلە وتەی خوای پەروەردگار تێرنەدەبوون ، پێم خۆش نیە شەوو ڕۆژ بێت بەسەرما ئیللا سەیری قورئان دەکەم ولێ ی وورد دەبمەوە .

ملکەچی ڕاستەقینە لە نوێژدا لەلای ئیمامی ئیبنولقەییم (خوای لێ ڕازی بێت) بە ملکەچی ئیمان ناو دەبرێت، و پێناسەی دەکات بەوەی:

ملكەچی نواندنی دڵ بۆ خوای پەروەردگار بە گەورە زانین و، ڕێزو شكۆو هێمنی و شەرم كردن لە خوا دێتە دی، ملكەچی: دڵەكان لە ئاستی خوادا نەرم دەكات وپڕیان دەكات لە ترس و شەرم و خۆشەویستی خوای پەروەردگار.....

هەروەها ملكەچی نواندن نوێژ ئاسان دەكەن و، لە دەروونی مرۆڤدا خۆشەویستی دەكەن، عبدالرحمن بن ناصر السعدی (خوای لێ ڕازی بێت) لە تەفسیری ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ دا فەرمویەتی: نوێژ كردن لەلای بێ بڕوایان قورس وناڕەحەتە تەنها لەلای بڕواداران ولەخواترسان ئاسانە ، لەبەر ئەوە ملكەچی و ترسان لە خوا، وە ئومێدبوون بەو پاداشتەی كە بۆ نوێژ كردن و نوێژگەران دانراوە، وادەكات لەبڕوادار بە ئەركەكانی هەستێت و ودڵ و دەروونی مرۆڤی باوەڕدار فراوان دەكات، كەلەلای ئاسان بێت، لە پێناو بە دەست هێنانی پاداشت و لێ خۆش بوونی خوای گەورەو ڕزگاربوون لە سزای ئەو .

ئەگەر نوێژ كردن بریتی بێت لە پەیوەندی نێوان پەروەردگارو بەندە، ئەوا پێویستە ئەو نوێژە مرۆڤ لەسەرقاڵی دونیا ڕزگار بكات.

پێویستە نوێژ مرۆڤی باوەڕدار بەرەو لای زاتی پیرۆزی خوا ببات، هەروەك پێویستە نوێژ بەردەوامی ببەخشێتە مرۆڤ لەسەر هیدایەت و شوێن ڕاستی كەوتن، وە دەبێت مرۆڤ لەسەر بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام جێگیرو دامەزراو بكات، وە پێویستە ئاماژە بەوە بدەین كە چۆنیەتی

ئەنجام دانی نوێژ لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر جیاوازە، كەسانێك نوێژیان وەك عادەت و خوو وەرگرتووەو بەهۆیەوە دڵ و هۆشیان لای نوێژەكە نیە، سەرئەنجام لە ڕووی وەرینی تاوانەوە وەك پێش نوێژ كردنەكە دەمێننەوەو هیچ گۆڕانێك بەسەر تەرازووی كردەوەكانیاندا نایەت بە ئاڕاستەی كەم بوونەوەی خراپەكان و زیاد بوونی كردەوە چاكەكانیان.؟ چونكە نوێژەكەیان ئەوەندە بە خۆ زەلیل كردن و ملكەچیەوە ئەنجام نەداوە كە ببێتە هۆكاری وەرینی تاوانەكانیان، بەلاَم كۆمەڵی دووەم هێندە بە ترس و دڵسۆزییەوە خۆیان بۆ نوێژ ئامادە دەكەن كە سەرئەنجام خوای گەورە ڕاستەوخۆ نوێژەكەیان وەردەگرێتو لە تاوانەكانیان خۆش دەبێت؟ چونكە ئەم جۆرە كەسانە لە گرنگی نوێژو گەورەیی ئەو عیبادەتە گەیشتوون، ئەوە عەلی كوڕی حەسەنە (خوای لێ ڕازی بێت) كاتێك دەست نوێژی دەگرت ڕەنگی دەگۆڕا، كە پرسیاری لێ دەكرا بۆچی وات لێ هاتووە.؟ لە وەلاَمدا دەیوت: ئێستا كاتی ئەنجام دانی ئەمانەتێكەو تیایدا بەندە لەگەڵ پەروەردگاریدا گفتوگۆدەكات، منیش لەبەرشەرم وترسمە لە بەدی هێنەرەكەم وارەنگم زەرد هەڵدەگەڕێت.!؟

ئەو نوێژەی ئیسلام داوای دەكات تەنها بریتی نیە لە چەند وتەیەك كە بە زمان بوترێن و چەند جووڵەیەك كە لەلایەن ئەندامەكانی جەستەوە ئەنجام بدرێن، بەڵكو ئەو نوێژەی ئیسلام لە ئیماندارانی

دەوێت بیركردنەوەیە بە عەقڵ و ملكەچیە لـە دڵدا، هـەروەك لـە ڕۆژی دواییدا نوێژ یەكەم عیبادەتێكە كە لـە بارەیـەوە پرسـیار لـە بەنـدەكان دەكرێت..

لـە ئـەبو هـورەیرەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی:

﴿إن أوّل ما يحاسب بـه العبـد يـوم القيامـة مـن عملـه صـلاته، فـإن صلحـت فقـد أفلح وأنجح، وإن فسـدت فقد خاب وخسـر فإن انتقـص من فريضته شيء، قال الرب عز وجل: أنظروا هل لعبدى من تطـوع؟ فيكمـل بها من انتقص من الفريضة.؟ ثم تكون سائر أعماله على ذلك﴾.

سـەبارەت بـە حـوكمی نوێـژ نەكـەر، زۆربـەی زانایـانی كـۆن و نـوێ بۆچوونیان وەهایە: هەركەسێك نوێژ نەكات كافرو بێ باوەڕەو لە ئیسلام دەچـێتە دەرەوەو، پەیوەنـدی بـە ئـاینی ئیـسلامەوە نامێنێـت ،ئـەو فەرمودانەی كە دانیان ناوە بە كافر بوونی نوێژ نەكەردا وەك:

لە عەبدوڵڵای كـوڕی عـەمری كـوڕی عاسەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت ) هاتووە: كـە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆژێـك باسـی نوێـژی دەكـردو فـەرمووی: ﴿من حافظ عليها كانـت لـه نـوراً وبرهانـاً ونجاتـاً يـوم القيامـة، ومـن لم يحافظ عليها لم تكن له نوراً ولا برهاناً ولانجاتـاً، وكـان يـوم القيامـة مـع قارون وفرعـون وهامـان و أُبيـى بـن خلـف﴾ رواه احمـد والطبرانـي وابـن حبان وأسناده جيد.

واتە: هەركەس نوێژەكانی پاراست و بە ڕێك و پێكی ئەنجامی دان ئەوە بێگومان بۆی ئەبن بە ڕووناكی و بەڵگەو ڕزگاری لە ڕۆژی دواییداو، هەركەس نەیپاراستن، نە ئەبنە ڕووناكی و نە بەڵگەو نە ڕزگار بوونو، لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ قارون و فیرعەون و هامان و ئوبەی كوڕی خەلەفدا حەشر دەكرێت..!!

جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إن بين الرجل وبين الشرك والكفر ترك الصلاة﴾ رواه مسلم ل٢٦، صحيح مسلم.

واتە: لە نێوانی پیاو و لە نێوانی بێ باوەڕییدا واز هێنانە لە نوێژ كردن، هەركەسێك واز لە نوێژ كردن بهێنێت ئەوە كافرو موشریكە.

هەروەها بورەیدە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿العهد الذى بيننا و بينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر. ﴾. رواه ابن ماجة

واتە: جیاوازی نێوان ئیمانداران و بێ باوەڕان نوێژە، هەركەسێك نوێژ نەكات ئەوە بێ باوەڕە.

چەندین فەرموودە هەن كە لە ڕواڵەتدا وا پێویست دەكەن كە نوێژ نەكەر كافرەو خوێنی حەڵاڵە، بەڵام زۆرلە زانایانی پێشین و دواین واتا (سەلەف و خەلەف) لەوانە ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی لەسەر ئەو ڕایەن كە نوێژ نەكەر كافر نیەو بەڵكو لە

فـەرمانی خـوا دەرچـووەو فاسـیقە، وەپێویـستە نوێـژ نەکـەر داوای لێبـووردن و پەشـیمان بوونـەوەی لێ بکرێـت، پاشـان ئەگـەر پەشـیمان نەبوویـەوە بـە حـەددی شـەرعی ئـەکوژرێت، ئەمـە بۆچـوونی هەریەکـە لـەئیمامی شـافیعی و مالیـك و چـەندین زانـای تـرە.. ئیمـامی ئـەبو حەنیفـەش (خـوای لێ ڕازی بێـت ) دەفـەرمێت: نوێـژ نەکـەر ناکوژرێـت بەڵکو سەرزەنشت و زیندانی دەکرێت، هەتا دەست دەکاتەوە بـە نوێـژ کردن، هەروەها هەندێ لە زانایان جیاوازی دەکـەن لـەنێوان دوو کەسـی نوێژ نەکەردا، یەکێکیان لەبەر ئـەوە نوێـژ ناکـات کـە بـاوەڕی پێـی نیـە بەڵام ئەوی تریان باوەڕی بە نوێژ هەیەو وەك پایەیەکی گرنگـی ئیـسلام سەیری دەکات، بەڵام تەمەڵیەکەی هۆکاری نوێژ نەکردنیـەتی، یەکـەم دەست بەجێ کافر دەبێت، بەڵام ئەو کەسەی لەبەر تەمەڵی نوێژ ناکات وەك ئیمـامی ئـەبو حەنیفـە (خـوای لێ ڕازی بێـت ) دەفـەرمێت: سەرزەنشت دەکرێت و زیندانی دەکرێت تا دەست دەکاتەوە بە ئـەنجام دانی نوێژەکانی.

ئیمامی ئەحمەدیش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: هەر کەسێك لەبەر تەمەڵی نوێژ نەکات کافر دەبێت، چونکە ئەگـەر مرۆڤ بە ڕاسـتی باوەڕی بە نوێژکـردن هەبێت، ئەوە نوێـژ دەکـات، کەواتـە هـەر کەسێك نوێژ نەکات هۆکارە سەرەکیەکەی ئەوەیە کە باوەڕی بە نوێژ کردن نیە،

لەبەر ئەوە هەركەسێك باوەڕی بە نوێژ كردن نەبێت ئەوە ئیماندار نیە؟ چونكە بە كەسێك دەوترێت ئیماندار كە بە تەواوی:

١) سەری بەندایەتی دانەوێنێت بۆ خوای گەورە.

٢) گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا نوێژ یەكەم شتێكە كە لە ڕۆژی دواییدا لە بارەیەوە لە بەندە پرسیار دەكرێت، هەر سەبارەت بە نوێژ خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾﴾.

واتە: كاتێك پرسیاریان لێ دەكرێت لە هۆكاری مانەوەیان لە سەقەردا، ئەوانیش دەڵێن هۆكاری مانەوەمان ئەوەیە كە ئێمە لە دونیادا لە كۆمەڵی نوێژ خوێنان نەبووین... ئاشكرایە سەقەر ناوێكە لە ناوەكانی دۆزەخ.

سەبارەت بە ڕاهێنانی منالان لەسەر نوێژ كردن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: كاتێك منالەكانتان تەمەنیان بوو بە حەوت سالان، فەرمانیان پێ بكەن بۆ نوێژ كردن، لە تەمەنی دە سالاندا ئەگەر نوێژیان نەكرد لێیان بدەن. واتە لێدانەكە بۆ ئەوە بێت كە فێری چۆنیەتی ئەنجام دانی نوێژ ببن و لەسەری ڕابێن و ڕەوشتی نوێژ خوێنان شارەزا بن، بە واتایەكی تر لێدانەكە پێویستە بۆتەمێ كردن بێت..!

لە كۆتایی دا سەبارەت بە گرنگی نوێژو تام و چێژ وخشووع و ملكەچی لە نوێژدا وتەیەكی زانای پایەبەرز ئیبنو تەیمیە (خوای لێ ڕازی

بێت ) بەنمونە دەهێنینەوە کە دەفەرمێت:( إنَّ في الدنيا جنة من لم يدخلْها لم يدخل جنة الآخرة).

مەبەست بە بەهەشتی دونیا نوێژە..!

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين.

کاروان ڕەشید محی الدین

خورماڵ ٢٠٠٩/١١/١٠

# پێشەکی مامۆستا سید أحمد

تەنها بەناوی خواوە

ئەگەر نوێژێك کە لە کتێبە فیقهیەکاندا باس ئەکرێت زیاتر لە دە ڕوکن و پایەی چڕو پڕو سەرەکی هەبێت، کە بەوانە نەبێت، ئەو نوێژە دانامەزرێت وقبوولْ نابێت.. پێویستە دە پایەو زیاتریشی هەبێت، کە لە دەرەوەی پەیکەری ئەم نوێژەوە بن و، بە جەوهەرو کاکلْ و مۆخی نوێژەکە دابنرێن، تاکو بە نوێژ حسێب بێت و، خاوەنەکەی پەروەردە بکات و لە تاوان و گوناهەکانی دوور بخاتەوە، ئەگینا ئەوە نوێژێکە تەنها جەستەی هەیەو گیانی تیا نیە، تەنها پەیکەرو وێرانەیەکەو، زیندەوەری لەناودا نیە.

سەیر ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز ئەو هەموو گرنگیەی داوە بە هەناو و ناخی نوێژو، پێغەمبەری خۆشەویستیش (ﷺ)، ئامـاژەی بە هەموو ئەو جەوهەرو ناوەڕۆکەی کردووەو، بەشێوەی کردار ئەنجامیداوەو، بەرجەستەی کردووە، کەچی هەموو کتێبە فیقهیەکان پشت گوێیان خستووەو، خشووعیان نەکردووە بە یەکێك لەو ڕووکن و پایە سەرەکیانەی نوێژ، بەڵکو ئەگەر کەسێك بیەوێت لەم بابەتە تێ بگات، ئەبێ بچێت بۆ خوێندنەوەی کتێبی تەزکیەو تەصەوف وەك (ئەحیای غەزالی و نموونەکانی) بەڕاستی ئەبووایە کتێبە فیقهیەکان لەسەر ڕێڕەوی قورئان و فەرمووده بڕۆشتنایەو، نوێژیان بە کامڵی گیان و

جەستەوە باس بكردايە، نەك كاكڵ و جەوهەرەكەى لەلاشەكەى دوور بخەنەوەو، ئەو هەموو شەرح و حاشيە بكەن لە باس و مەسەلەكانى پەيوەنديدار بەلاشەكەيەوە، خۆزگە ئەو گرنگيەيان بە كرۆك و گيانى نوێژ بدايەو، ئەو هەموو دوورو درێژييەيان نەدايە بە مەسەلەكانى ترى ئەم درووشمە مەزنە، كە كۆڵەكەى ئيسلامە.

بەڕاستى ئەگەر ئەو كارە ئاوا بكرايەو، ئەو كتێبانە وايان بنووسيايەو، وايان داڕشتايە، ئێستا نوێژ كەران جۆرێكى تر بوون و، ڕەفتارو ئاكارو كرداريان شيرين ترو پرشنگدار تر بوو...ئەگەر وايان بكردايە ئێستا مرۆڤى نوێژكەر زۆرى فەرق بوو لە كون و قوشبنەكانى ژيان و ژينگەدا، زۆر جياواز بوون لەوانەى تر، كە نوێژ ناكەن و، توخنى مزگەوت و جەماعەت ناكەون... ئەبووايە ئەم باباى نوێژكەرە جۆرە فريشتەيەك بووايە لە بوارەكانى كڕين و فرۆشتن و بازاڕو، بوارى سياسەت دا، لە بووارى خێزان و كۆمەڵگادا.. بەڵكو لە هەموو بوارەكانى ترى ژياندا ئاماژەيان بۆ بكرايەو، بە نموونە بهێنرانايەتەوە. ئێستا كەبەداخەوە ئەم كارە ئاوەها نەكراوە، خانەى خشووع كە (گيان و جەوهەرى نوێژە) لە پايە سەرەكيەكانى نوێژ جيا كراوەتەوە... خۆشبەختانە براى لاو كاكە كاروان ڕەشيد، بڕێكى لەم كەلێنە پڕ كردۆتەوە، هەندێك چارەسەرى ئەم ناهەمواريەى كردووە، ئەويش بە وەرگێڕانى ئەم ناميلكەيەى شێخ (محمد صالح المنجدى سعودى) ە،

دەستخۆشی لە کاکە کاروان دەکەین، وە لە خوای مەزن و میهرەبان دەخوازم نوێژەکانمان بکاتە ئیسراحەتی دڵەکانمان و، ئاسوودەیی ناخمان و، ڕووناکبوونەوەی چاوەکانمان و، شیرین بوونی ڕەوشت و ڕەفتارمان و، پاشانیش لێمان وەربگرێت و، لە کەم و کورتیەکانمان ببوورێت و، گەنجانی تری وەکو کاکە کاروانمان بۆ زۆر بکات و، هەموومان خاشع و خاچع بکات بۆ زاتی پاکی خۆی. !

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته!

أحمد سيد عبدالوهاب پێنجوێنی (هەولێر)

ذي لقعدة ١٤٣٠ك — ٢٠٠٩/١١/١ز

# پێشەکی نوسەر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله ربِّ العالمين والصلاة والسلام على رسول الله وعلى الـه و أصحابه اجمعين وبعد.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

بێگومان نوێژ گەورەترین پایەی کرداری ئیسلامە،خشوع و ملکەچی نواندن تیایدا یەکێکە لەداواکارییە سەرەکیەکان کە شەریعەتی خوای پەروەردگار داکۆکی لەسەر دەکات، وە دوژمنی خوا (ئیبلیس) لەفەرمانی خوا یاخی بوو، سوێندی خوارد، کە بەندەکانی خوا لەشارێی ئیسلام لابدات و گومڕایان بکات،مەگەر ئەوانە نەبن کەبە دڵسۆزیەوە خوای خۆیان دەپەرستن، بۆیە شەیتانی بێ بەری کراو لە ڕەحمی خوا هەوڵ دەدات بە بەکارهێنانی هۆکاری جیاواز، نوێژخوێن دووچاری دوو دڵی و بیرکردنەوە لەناو نوێژەکەیدا بکات.

دوو دڵی و ملکەچ نەبوون هۆکارێکی گەورەیە کەشەیتان بەکاری دەهێنێت، بەهۆیەوە نوێژخوێن هیچ تام و چێژێکی دەروونی لەوبەندایەتیە گەورەیە نابینێت،جگە لەوەی چەندین زیانی تر لە نوێژ خوێن دەدات وەك بەفیڕۆدانی پاداشتی نوێژەکەی، لەگەڵ قورس کردن و گەورەکردنی نوێژ لەلای خاوەنەکەی ، سەرئەنجام مرۆڤی موسڵمان

دوچاری سستی نواندن و دواخستن و گوێ نەدان بەنوێژ دەکات، وادیارە شەیتان ئەم گرەوەی لەزۆربەمان بردوەتەوە.

دەبێت ئەوەش بزانین یەکەم شتێك لەلای بەندەوە بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە ڕادەی ملکەچی نواندنیەتی لەنوێژدا.

حوزەیفە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: یەکەم شتێك لەم ئاینەدا لە دەستی دەدەین ملکەچیە لەنوێژدا، وە کۆتا شتێك کەلە دەستی دەدەین نوێژە،تاوای لێ دێت نوێژ خوێن هیچ چاکەیەك لەنوێژدا نابینێت، تا ئەو ئاستەی ئەگەر بچیتە ناو مزگەوتێك هیچ کەسێکی ملکەچی تیادا نابینیت.

ئەوەی مرۆڤ لەخۆیدا هەستی پێ دەکات و لەزۆربەی خەڵکی دەوروبەری سکاڵا دەبیستێت سەبارەت بەبوونی دوو دڵی لەنوێژو نەبوونی ملکەچیە تیایدا.

ئەم نوسراوە یاد خستنەوەیەکە بۆ براوخوشکە موسڵمانەکانم و داواکارم لەخوای گەورە موسڵمانان لەم پەرتووکە سودمەند بکات .

سەبارەت بە ملکەچی و نوێژ خوێنە ملکەچ بووەکان خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝١ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۝٢﴾ واتە: بەڕاستی خەڵکانی خاوەن باوەڕ سەرکەوتو و ڕزگارن، چونکە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزانەن: ئەوانەی کەلە

نوێژەکانیاندا ملکەچن و هەردەم بەترسەوە نوێژ دەکەن و بەرامبەر بەخوا بەردەوام ئەهلی شەرمن.

شوێنی ملکەچی کوێیە؟

بێ گومان دڵ شوێنی سەرەکی ملکەچیە، و بەرهەمەکەی لەدڵەوە دابەش دەبێت بۆ هەمو بەشەکانی جەستەی مرۆڤ، چونکە هەموو بەشەکانی جەستەی مرۆڤ شوێن کەوتەی دڵن.

وەك پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إنّ في الجسد مضغة، إذا صَلُحت صَلح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهيَ القلب﴾. واتە: لە ناو جەستەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە چاك و باش بێت، ئەوا هەموو جەستەش ساڵح و باش دەبێت و، ئەگەر خراپیش بێت، بێگومان هەموو جەستەش خراپ دەبێت ئەو پارچە گۆشتەش بریتیە لەدڵ.

واتە:دڵ بەنیسبەتی جەستەی مرۆڤەوە وەك پاشا وەهایەو، جەستەش وەك سەرباز چۆن فەرمانیان لەدڵەوە بۆ بێت هەروا دەکەن.

شاردنەوەی ملکەچی:

حوزەیفە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: وریابن لەدووڕوویی لە ملکەچیدا! وتیان: دوو ڕوویی لەملکەچی دا چیە؟ فەرمووی: لەجەستەدا ملکەچی پێوە دیارە، بەلاَم دڵی ملکەچی خوا نەبووە لە نوێژەکەیدا.

هەروەها فوزەیلی كوڕی عیاز (خوای لێ ڕازی بێت ) دەفەرمێت: پێمان ناخۆش بوو گەر یەكێكمان دیتبا لەڕوخساردا ملكەچ بوایە، بۆیە پێمان دەوت فلانە كەس ملكەچی لەدڵ دایە ئامازەمان بۆ سنگی دەكرد...

دەتوانین بڵێین: دوو ڕوویی لەنوێژدا بریتیە لە حاڵەتێكی ئارام كردنەوەی دەروون بەشێوەی دەستكردو دروستكراو، بەڵام لەناوەوەی دەروونیدا ئارەزوو بەدی دەكرێت، لەبەر ئەوە لەڕوخساردا ملكەچی دەنوێنێت و لە هەردوو لاوە مارێكی جەنگەڵستان و شێرێكی دارستان وەستاون و چاوەڕێی نێچیرەكەیان دەكەن.

كەواتە ملكەچی لەنوێژدا پێویستی بەوە هەیە دڵی بۆخاڵی بكرێت،پێویستە نوێژ خوێن هەموو هەست و هۆشێكی لەلای نوێژەكەی بێت و بەهیچ شتێكی ترەوە خۆی خەریك نەكات، دەبێت تەنها ئاگای لەلای ئەو نورە گەورەیە بێت كەنوێژە، ئەگەر نوێژ خوێن بەو شێوازەی كرد ئەوا تام و چێژی تایبەتی لەنوێژەكەی دەبینێت، ئەو نوورە هەموو جەستەی دادەپۆشێت و هۆكارێكیش دەبێت بۆدامركاندنەوەی دڵ و زاڵ بوون و ئاسان هاتنە پێش چاوی كێشەكان و چارەسەر بۆ دۆزینەوەیان، نموونەی ئەو كەسانەی كەبەو شێوازە نوێژەكانیان دەكەن وەك نموونەی زەوییەكی تینوو وەهایە، كاتێك باران دەبارێت، چۆن پێشوازی لەو بارانە دەكات و پێی ئارام دەگرێت و لەتینوویەتی ڕزگاری

دەبێت و تێر ئاو دەبێت و پاشان شین دەبێت و لەکۆتاییدا بەرهەم دەدات.

لەبەر ئەوە نوێژ خوێنی لەناخەوە ملکەچ، زۆر بەشەرمەوە لەخزمەتی خوادا ڕادەوەستێت و، لەدڵەوە خۆی بە لاوازو بێ توانا بەرامبەر خوای گەورە نیشان دەدات و لەگەڵ چوونە کڕنووشیش سەربەرز ناکاتەوە تا بەتەواوی لەخزمەتی خوای گەورەدا دڵی ئارام دەگرێت.

لەسوودەکانی ملکەچی: ئەرکی نوێژ کردن لەسەر بەندە ئاسان دەکات، واتە بەندە ملکەچ بووەکان هیچ سەختی و گرانیەك لەئەنجام دانی نوێژ نابینن، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەردەوام لەخەمی ئەوەدان کەی کاتی نوێژ بێت تابچنەوە خزمەت خۆشەویستەکەیان، زۆر جاریش بەئەنجام دانی نوێژەکەو سەلام دانەوە دووچاری دڵەڕاوکێ و ئازاری دەروونی دەبن تادەگەنەوە بەنوێژێکی تر، وەك چۆن ماسی ئاوی لێ ببڕێت بەو شێوازە بەدوور کەوتنەوەیان لە نوێژ پەرێشان دەبن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَـٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ البقرة.

ئیمامی ئیبنولکەسیر(خوای لێ ڕازی بێت) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت: ئەنجام دانی نوێژ زۆر قورسە تەنها لەسەر ملکەچ بووان

ئاسانە . هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿أوّلُ شيءٍ يُرفع من هذهِ الأمة الخشوع، حتى لا ترى فيها خاشعاً﴾.

واتە: یەكەم شتێك كە لەم ئوممەتەدانامێنێت و لەناو دەچێت ملكەچیەلە نوێژدا، تاوای لێ دێت هیچ كەسێكی ملكەچی تێدا نابینیت. (ملكەچیش بریتیە لەوەی تەنها بیرت لای خوا بێت و هەموو هەستەكانت بەو سپاردبێت).

هەندێك لەپێشینان وتویانە: نوێژی ساردوسڕو بێ ئاگا وەك ئەوەیە ئەسپێكی شەل و كوێرو سەقەت وماندووی برسی وبێ كەڵك....بەدیاری ببەیت بۆ پادشایەك، گومانت چۆنە ئایا ئەو پادشایە دیاریەكەت لێ وەردەگرێت؟!! ئەی ئەگەر نوێژێك كەبەندەیەكی لاواز ئەنجامی دەداتو بەدیاری بۆ خوای بەرز دەكاتەوەو ،دەیەوێت بەهۆیەوە خوا لەتاوانەكانی خۆش بێت و ببێتە هۆكاری نزیك بوونەوەی لەخوای پەروەردگار، كەواتە خوا پاكەو پاكی خۆش دەوێت؟پاكی نوێژێك لەكوێدایە ملكەچی و چێژێكی دەروونی تیادا نەبێت، پێویستەهەموان بەسەرهاتی ئەو پیاوە ساڵحە بهێنینە پێش چاوی خۆمان كاتێك قاچی دووچاری نەخۆشیەك دەبێت، دكتۆر پێی دەڵێت: تەنها چارەسەر بڕینەوەی قاچەكەتە، ئەویش زۆر بەئاسانی دەڵێت: لەنوێژدا قاچم ببڕنەوە چونكە من هۆشم لای ئازاری قاچەكەم نیەو سەرگەرمی نوێژم لەگەڵ خۆشەویستەكەمدا؟! بەبێ ئەوەی كەهەست بەهیچ ئازارێك بكات

لەنوێژەكەیدا و بەبێ هەبوونی هیچ جۆرە داوو دەرمانێكی بەنج كردن قاچیان بڕییەوە؟

## حوكمی ملكەچی لەنوێژدا:

حوكمی شەرع بۆ ملكەچی لەنوێژدا لای زۆرێك لەزانایان واجیبە.

ئیمامی پایە بەرز ئیبنو تەیمیە (خوای لێ ڕازی بێت) لەتەفسیری ئایەتی ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ٤٥﴾ البقرة، دا دەفەرمێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر زەنشت كردن و ڕەخنە گرتن لەو كەسانەی لە نوێژەكانیاندا ملكەچ نین ، ڕەخنەو سەر زەنشت كردن تەنها بۆ وازهێنان لەواجبێك و ئەنجام دانی كارێكی ناشەرعی و یاساغ و حەرام دێت، وەكاتێك ڕەخنەو سەرزەنشت كردن ئاڕاستەی ملكەچ نەبووان دەكرێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەوازیان لەواجبێك هێناوە كەئەویش ملكەچ بوونە لەنوێژدا.

سەبارەت بەگەورەیی ملكەچ بوون لەنوێژدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت:

﴿خمس صلوات افترضهنّ الله تعالى، من أحسن الوضوء وصلاهن لوقتهن، وأتم ركوعهن وخشوعهن كان له على الله عهد أن يغفر له، ومن لم يفعل فليس له على الله عهد ان شاء غفرله وإن شاء عذبه﴾.

واتە: خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر بەندەكانی خۆی پێویست كردووە، هەركەسێك بەجوانترین شێوە دەست نوێژ بگرێت و بەڕێك و

پێکی و لەکاتی خۆیدا ئەنجامیان بدات، ئەوە لەخواوە بەڵێنی لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسە هەیە، هەرکەسێکیش بەو شێوەیەی نەکرد هیچ بەڵێنێك لەلایەن خواوە بۆ لێخۆشبوونی ئەو بەندەیە نیە، ئەگەر بیەوێت لێی خۆش دەبێت، ئەگەریش بیەوێت سزای دەدات.

هەر لەم بارەوە هاتووە کە: عن حمران، مولی عثمان (رضي الله عنه) أنّ عثمان بن عفان دعا بوضوء فتوضأ: فغسل كفيه ثلاث مرات، ثم مضمض واستنثر، ثم غسل وجهه ثلاث مرات، ثم غسل يده اليمنى الى المرفق ثلاث مرات، ثم غسل يده اليسرى مثل ذلك، ثم مسح رأسه، ثم غسل رجله اليمنى الى الكعبين ثلاث مرات، ثم غسل اليسرى مثل ذلك، ثم قال: رأيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) توضأ نحو وضوئي هذا، ثم قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (من توضأ نحو وضوئي هذا، ثم قام فركع ركعتين، لايحدث فيهما نفسه، غفر له ماتقدم من ذنبه).

قال ابن شهاب: وكان علماؤنا يقولون: هذا الوضوء أسبغ مايتوضأ به أحد للصلاة.

واتە: حەمران کارگوزاری عوسمانی کوڕی عەففان (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: عوسمانی کوڕی عەففان داوای ئاوی دەست نوێژی کردو،پاش ئەوەی ئاوم بۆ هێنا دەست نوێژی گرت: دەستەکانی سێ جار شۆردو ئاوی لە دەم و لووتی وەردا،سێ جار دەم و چاوی شۆری، ئینجا دەستی ڕاستی هەتا ئانیشکی سێ جار شۆردو، دەستی چەپیشی

بەو شێوەیە شۆرد.. پاشان مەسحی سەری کرد، دواتر قاچی ڕاستی تا قوولەپێی سێ جار شۆردو، قاچی چەپیشی بە هەمان شێوە شۆرد، ئینجا فەرمووی: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینیوە وەکو ئەم دەست نوێژەی من دەست نوێژی گرتووە، پاشان فەرموویەتی: (هەرکەس دەست نوێژ وەکو ئەم دەست نوێژەی من بگرێت، ئینجا هەستێت و دوو ڕکات نوێژ بکات، دالغە لێ نەدات لە نوێژەکەیدا، ئەوا بێ گومان خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێت).

ئیبنو شیهاب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: زانایانمان دەفەرموون: ئەم دەست نوێژە تەواوترین دەست نوێژە بۆ نوێژ کردن ئەگەر کەسێك بیگرێت.

## دوو هۆکاری یارمەتیدەر بۆ ملکەچ بوون لەنوێژدا:

یەکەم: پێویستە بەندە ئاگای لەو قورئان و ویردو نزاو پاڕانەوانە بێت کەلە نوێژەکەیدا دەیان خوێنێت و بەوردی لەواتاکانیان ڕامێنێت،وەدەبێت بەئامادەییەکی تەواوەوە قسە لەگەڵ پەروەردگاری بکات!؟

چونکە نوێژ گفتوگۆو وتو وێژ کردنە لە گەڵ پەروەردگاردا، کەواتە دەبێت بزانی چی دەڵێیت!! پەرستنی خوای گەورە بەو شێوازەی کەوا بزانی خوا دەبینیت، خۆ ئەگەر تۆ خوا نەبینی ئەوا بێگومان خوای

گەورە تۆ دەبینێت، كەئەمەش بەرزترین پلەی ئیمانە بە پەروەردگار كە بەندە پێی دەگات.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿حُبِّبَ اليّ من دنياكم: النّساء والطيب، وجعلتْ قُرّة عيني في الصّلاة﴾.

واتە: دوو شتم لەدونیادا بۆ خۆشەویست كرا ئافرەت و بۆنی خۆش‌و، ڕوناكی چاوم لەنوێژدایە.

یان دەفەرمێت: ﴿أرِحنا بالصّلاة يا بلال﴾.

واتە: ئەی بیلال بەبانگدان بۆ نوێژ كردن ئاسوودەمان بكە.

دووەم: سۆراخ و پرسیار كردن لەمەڕ ئەو هۆكارانەی كەدەبنە هۆی بێ ئاگایی دڵ و دەروون لەنوێژ لەكاتی نوێژ كردندا: ئەو هۆكارانە چین كە هۆكارن بۆ بێ ئاگاكردنی نوێژ خوێن لەنوێژەكەی؟ بێ گومان زۆری دوو دڵی و گومان وا لە نوێژ خوێن دەكەن ئاگای لای نوێژەكەی نەمێنێت و سەرقاڵی دەكەن بەخۆشی یان كێشەو گیروگرفتە دونیاییەكان، بەو شێوەیە پێویستە سەرجەم هۆكارەكانی بێ ئاگا بوون لەنوێژو ملكەچ نەبوون دیاری بكرێن و پاشانیش چارەسەرەكانیان دیاری بكرێن.

براتان

محمد بن صالح المنجد

# هۆكارەكانی ملكەچ بوون لەنوێژدا:

## یەكەم: سووربوون لەسەر پەرەپێدان و بەهێزكردنی ملكەچی لەنوێژدا:

**ئەمیش بەهۆی:**

### ١) خۆ ئامادەكردن بۆ نوێژو پەیوەست بوون پێوەی:

ئەویش بە وەڵامدانەوەی بانگ بێژو وە نزاكردن و پاڕانەوەی كۆتایی بانگ دەبێت ﴿اللّهمّ ربّ هذه الدّعوة التامّة، والصلاة القائمة، آت محمّداً الوسيلة والفضيلة، وابعثه الله المقام المحموداً الذي وعدْتّه﴾ واتە: {خوایە ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواو و نوێژە دامەزراوە، پلەی بەرزی (الوسیلە) كەشوێنێكە لەبەهەشتدایە، و بۆكەس نابێت جگە لەبەندەیەك لەبەندەكانی خوای گەورە، ببیەخشە بەپێغەمبەری نازدارمان (ﷺ)}.

وە لە شوێنێكی تردا دەفەرموێت: {ئومێدم وایە ئەو كەسە من بم} و(الفضیلة) كەپلەیەكی زیادەیە بەسەر دروست كراوەكاندا، وەبیبەرە ئەو شوێنە سوپاس كراوەی كەبەڵێنت پێداوە كەپلەی شەفاعەتی گەورەیە لەرۆژی دوایی دا}.

هەروەها نزاکردن لەنێوان بانگ و قامەتدا، بەناوی خوا و پاشان جوان دەست نوێژ شتن و نزاو پاڕانەوەی دوای دەست نوێژ ﴿اللهم اجعلني من التوابين وجعلني من المتطهرين﴾.

واتە:(خوایە لەتەوبەکاران و پاك بووەکانم بگێڕە)،وە سیواك کردن کە سوننەتێکی موئەککەدەی پێغەمبەری خوایەو،هەمان کات پاك کەرەوەیەو بۆنی دەمیش خۆش دەکات، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانمان پێ دەکات بەپاك کردنەوەی دەم بەسیواك کردن لەپێش قورئان خوێندندا.

هەر لەو بارەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمێت ﴿لولا أن أشقّ على أمتي، لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة﴾.

واتە: ئەگەر لەسەر ئوممەتم قورس نەبووایە، فەرمانم پێ دەکردن کە لەگەڵ هەموو نوێژێکدا سیواك بکەن.

هەروەها خۆڕازاندنەوە بەجل و بەرگی جوان و خاوێن و، خۆ بۆن خۆش کردن وەك خوای گەورە دەفەرمێت ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ......﴾الاعراف ٣١.

واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم هەر کاتێك دەچنە مزگەوت بۆ نوێژو هەر خواپەرستیەکی تر، جل و بەرگی جوان و خاوێن لەبەر بکەن و...

چونكە خوای گەورە لەپێشترە كەخۆمانی بۆ برازێنینەوە، هەروەك پۆشاكی خاوێن و جوان ئارامشی دەروونی و جەستەیی دەبەخشێتە خاوەنەكەی، بەپێچەوانەی پۆشاكی خەوتن و ئیش كردنەوە.

هەروەها خۆپۆشتە كردن و لابردنی پەڵە بەجل و بەرگەوەو دەست پێشخەری و ،ڕۆیشتن بەرەو مزگەوت بەهێمنی و لەسەرخۆیی و دواتر پەنجە نەكردن بەناو یەكترداو چاوەڕێ كردنی نوێژ، هەروەها ڕێك كردنی ڕیزەكان لەكاتی نوێژداو پاڵدان بەیەكترەوە لەڕیزەكاندا.

هەر سەبارەت بەهێمنی بەرەو مزگەوت ڕۆیشتن و پەلە نەكردن، ئەبوقەتتادە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: ﴿بينما نحن نصلي مع رسول الله (ﷺ) فسمع جلبة، فقال ماشأنكم..؟ قالوا: أستعجلنا الى الصلاة، قال: فلا تفعلوا، إذا أتيتم الصلاة، فعليكم السكينة، فما أدركتم فصلوا، وما سبقكم فأتموا﴾ واتە: لەكاتێكدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) نوێژمان دەكرد، گوێی لەدەنگی پەلە پەلیەك بوو، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: پەلەمان كرد بۆ نوێژ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئاوها مەكەن،كاتێك هاتن بۆ نوێژ بە پەلە پەل و هەڵە داوان مەیەن بۆ نوێژ و پەلە پەل مەكەن،بەڵكو بە هێمنی و لەسەرخۆ وەرن بۆ نوێژ، ئەوەی پیایدا ڕاگەیشتن ئەنجامی بدەن،ئەوەیشی كەلە دەستتان چووە پاش سەلام دانەوەی ئیمام هەستنەوەو تەواوی بكەن.

هـەروەها بـۆ ئـەوەی دوچـاری ئـەو حاڵەتـە نـەبین و لـەپێناو بـەهێمنی ڕۆیـشتن بـۆ مزگـەوت وا باشـترە کـە ڕەچاوی ئـەم خاڵانـە بکەین:

یەکـەم: وا باشـە کـە شـەو زوو بنـوین و بـەیانیان زوو لەخـەو هەستین؟چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی کە شـەو درەنـگ دەنـون نوێـژی بەیانیانیان دەفەوتێت یاخود درەنگ وەخت ئەنجامی دەدەن.

دووەم: بـێ گومـان خوێنـدنی زیکرەکـانی پـێش خـەوتن کاریگـەری زۆریان هەتا زوو خەبەرمان بێتەوەو بەنوێژی بەیانیدا بگەین.

سێ یـەم: وا باشـە کـە پـێش نوسـتن بـە خـەیاڵی نوێـژی بەیانیـەوە بخەوین،کەئەمەش هۆکارێکی سەرەکیە تا ڕۆحمان بـەئاگا بێت،زۆربـەی ئەوانـەی کـە بـە خـەمی لەدەسـت چـونی نوێـژەوە سـەر دەنێنـەوە، ڕاستەوخۆ لەکاتی خۆیدا بـەئاگا دێنـەوە بـەبێ ئـەوەی کـە کاتـژمێریش تەوقیت بکەن.

چوارەم: زانینی کاتەکانی نوێـژ،بێ گومـان ئەمـەش کاریگـەری زۆری هەیە هەتا نوێژ خوێن لەکاتی خۆیدا ئامادە بێت و،پەنا نەباتە بەر پەلە کردن بۆ ڕۆیشتن بەرەو مزگەوت.

پێنجەم: تـێ گەیشتنی زیاتر لەو ئایـەت و فەرمودانـەی کـە بـاس لـە خێرو گەورەیی ئامادە بوونی پێش وەخت دەکەن بۆ نوێژ.

## ٢ ) ئارامی و دڵنیایی لەنوێژدا :

پێغەمبەرمان (ﷺ) لەكاتی نوێژ كردنـدا، هێنـده بـەئارامی و دڵنیاییەوە نوێژی دەكرد تائەو ئاستەی هەموو جەستەی وابەستەی نوێژەكە دەبوو،بەشێوازێك لەگەڵ چونە ناو نوێژ وازی لـە هەموو شتێك دەهێنا كە ببێتە هۆكاری بیّ ئاگا كردنی لـە نوێژەكەی،هەر بەهەمان شێوەیش فەرمان بە موسڵمانان دەكات، وەك دەفەرموێت: ﴿لاتتم صلاة احـدكـم حتـى يفعـل ذلك﴾.

واتـە: نوێـژی هـیچ كەسێكتان تـەواو نابێـت هـەتا بـەو شێـوەیە ئەنجامی نەدات. واتە: دەبێت بەو شێـوازە نوێژ بكەین كە پێغەمبەرمان (ﷺ) نوێژی كردووە.

لەئەبوقەتادەوە(خوای لیّ ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە كەپێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) فەرموویەتی:

﴿أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته، قال يا رسول الله (ﷺ) كيف يسرق صلاته ؟ قال: لايتم ركوعها ولا سجودها﴾.

واتە: خراپترین مرۆڤ ئەو كەسەیە كەدزی لەنوێژەكەیدا دەكات! هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن دزی لەنوێژەكەی دەكات؟ فەرمووی: ناتەواوی هەیە لەچەمینەوەو كڕنووش بردنیدا..

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمێت: ﴿مثـل الـذی لایتـم رکـوعـه، وینـقـر فـي سجـوده، مثل الجائع یأکل التمـرة والتمرتیـن، لایغنیـان عنـه شــیئا﴾.واتــه: نموونــەی ئــەو کەســەی کــە کــەم و کــورتی هەیــە لەچەمینەوەو لەکڕنووش بردنیدا و دەنـوك دەوەشـێنێت، وەك نموونـەی کەسێکی برسی وەهایە کەدەنکێ یا دوو دەنـك خورمـا دەخـوات و هـیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت.

هەروەك ئەو کەسەی کە پەلە دەکات ئارام و دڵنیا نیە لەنوێژەکەیـدا ،ناتوانێت ملکەچی بۆ خوای گەورە فەراهەم بکات؟ چـونکە پەلـە کـردن ملکەچی ناهێڵێت لەنوێژدا.

## ٣ ) یادکردنەوەی مردن لەنوێژدا :

بێ گومان یەکێك لەو شـتانەی کـە دەبێتـە هـۆی خـشوع لـە نوێـژدا بیرکردنەوەیـە لـەمردن؟ چـونکە بیرکردنـەوە لـە مـردن تـرس دەخاتـە دڵەوەو،ڕۆژی دوایی بیری مرۆڤـی بـاوەردار دەخاتـەوە و ملکەچـی زیـاد دەکات،هەروەها دەبێتە هۆی گەردن کەچی زیاترو هەمان کات هاندەری مرۆڤە هەتا بەشێوەیەکی ڕێك و پێك نوێژەکەی ئەنجام بدات.

لەم بارەوە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەفـەرمێت: ﴿أذکــر المــوت في صلاتـك، فإن الـرجـل اذا ذکـر المـوت فــي صـلاته لحـري ان یحـسـن صلاتــه، وصلّ صلاة رجـل لایـظن أنــّه یصلي صلاة غیرها﴾.

واتە: لەنوێژدا یادی مردن بکەرەوە ،بێ گومان ئەگەر پیاو لە نوێـژدا یـادی مردنـی کرد،ئـەوە شـایانی ئەوەیـە نوێژەکـەی جـوان ئـەنجام بدات،نوێـژ بکـەن وەك ئـەو پیـاوەی کـە نوێژەکـەی وەهـا دەکـات وەك ئەوەی کە دواهـەمین نوێـژی بێـت ئیـدی بـە نوێـژی تـر ناگات،ئەوەنـدە بەملکەچیەوە نوێژەکەی ئەنجام دەدات.

بـە واتایـەکی تـر پێویـستە مرۆڤـی باوەڕدار بەشـێوازێك نوێژەکـەی ئەنجام بدات هەستێکی ئـەوتۆ بداتـە خـۆی بـەوەی کـە پـاش نوێژەکـە ژیانی دونیـا بـە جـێ دەهێڵێـت و،بەنوێـژێکی تـر ناگـات کـە بـێ گومـان ئەمـەش کاریگەریـەکی گـەورەی هەیـە هـەتا مـرۆڤ بـە ملکەچـیەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات.

هـەروەك پێغەمبـەر (ﷺ) ئامۆژگـاری ئـەبو ئـەیوبی ئەنـصاری دەکاتو دەفەرمێت: ﴿إذا قـمت فـي صلاتـك فصلِّ صلاة مودِّعٍ﴾.

واتە: کاتێك دەست دەکەیت بەنوێژ وەها ئەنجامی بدە کەوا بزانیـت دوای ئەو نوێژە ماڵئاوایی لەدونیا دەکەیت.

ملکەچی نواندن لەنوێژدا هۆکارێکی گرنگە والە نوێژ خـوێن دەکـات کە نەزانێ ئەمە کۆتا نوێژیەتی، یان خوای گـەورە تەمـەنی بـۆ نوێـژێکی تریش درێژ دەکات.

**٤) ڕامان و وردبوونەوە لەو ئایەت و ویردوو نزایانەی کەلە نوێژدا دەخوێنرێنەوەو کاریگەر بوون پێیان:**

چونکە قورئان بۆ تێڕامان و ورد بوونەوەیە،لەم بارەوە خوای پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ۝٢٩﴾ (ص: ٢٩).

واتە: ئەمە پەڕاوێکی پیرۆزە، دامان بەزاندووە بۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ)، تا ئەوانە لەئایەتەکانی ڕابمێنن و فامیدەو ژیرەکانیش ئامۆژگاری لێ وەربگرن.

هەرسەبارەت بەتەفسیری ئەم ئایەتە شێخ حەسەنی بەسری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: سوێند بەخوا لەبەر کردنی گشت پیتەکانی هەموو قورئان و پشت گوێ خستنی مەبەستەکانیشی تێ ڕامان و تێفکران نیە، هەندێ کەس ئەڵێن ئەمە سوێندی بێت تەواوی قورئانم لەبەرەو تەنها پیتێکم لێ نەپەڕاندووە ،بەڵام ئەگەر ماناو داواکارییەکانی پشت گوێ خستبێت، سوێند بەخوا ئەو کەسە هەموو قورئانی پەڕاندوەو پشت گوێی خستووە.! تێڕامان و ورد بوونەوە کاتێك بەرجەستە دەبێت کەتۆ زانیاریت هەبێت بەمانای ئەو ئایەت و ویردانەی کە لە نوێژەکەدا دەیان خوێنیت، پێویستیشە بەپێی توانا هەوڵ بدەین بۆ تێگەیشتن و بیرکردنەوە لەواتای ئایەتەکان و کاریگەریش لەسەر ژیانی ڕۆژانەمان دروست بکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾﴾ (الفرقان: ٧٣).

واتە: ئەوانەی كاتێك ئایەتەكانی پەروەردگاریان وەبیر هێنرایەوە ئامۆژگاری وەر دەگرن و ناڕۆن بەسەریاندا وەك كەڕوو كوێر، بەڵكو گوێی بۆ هەڵدەكەن و چاو دەكەنەوە.

لێرەوە گرنگی زانین و شارەزابوون لەواتای قورئان دەردەكەوێت، لەم بارەوە ئیبن جەریری تەبەری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: من سەرم لەو كەسانە سوڕ دەمێنێت كەقورئان دەخوێنن و لەماناكەی تێ نا گەن، ئەو كەسانە چۆن تام و چێژ لەخوێندنەوەی قورئان دەبینن؟.

هەروەها تێڕامان و چەندبارە كردنەوە لەخوێندنەوەی ئایەتەكاندا، ئەمەش لەبەر ئەوەی زیاتر لەمانای ئایەتەكان بگەیت و بەواتاكانیان ئاشنا بیت، چونكە زۆر دوبارە كردنەوەی ئایەتەكان چێژێكی ئەوتۆ بەدەروونی مرۆڤ دەدات، كەبێ گومان هەر ئەو كەسانە هەست بەو چێژە دەكەن كەلە ماناو واتای ئایەتەكان تێ دەگەن و لەناخەوە لەگەڵ قورئاندا دەژین.

هەربەو جۆرەش لەپێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) بینراوە: كەجارێكیان شەو نوێژی دەكرد، بەدرێژایی ئەو شەوە بە بەردەوامی دەگریاو فرمێسك لەچاوەكانی دەهاتنە خوارەوە تا نوێژی بەیانی بە بەردەوامی

ئەم ئایەتەی دوبارە دەكردەوە ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨﴾ (المائده: ١١٨).

واتە: ئێستاش ئەگەر تۆ سزایان بدەیت بێ گومان بەندەی خۆتن و كەسیش بۆی نیە هیچ بڵێت، ئەگەر لێشیان ببوریت ئەوە خۆت چاك دەزانیت و بۆ خۆیشت دەستەڵاتدارو كار بەجێیت.

بێگومان بەو شێوازە تێڕامان و ورد بوونەوە لەئایەتەكان و دوبارە كردنەوەیان هۆكارێكە بۆ كاریگەری دروست كردن و زیاد بوونی ئیمان و بەرەو خوا چوون، حوزەیفە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژم دەكرد و قورئانی بەزمانێكی پاراو دەخوێند، ئەگەر بگەشتایە بەئایەتێك باسی سوپاسی خوای بكردایە، دەست بەجێ سوپاسی خوای گەورەی دەكرد، ئەگەر ئایەتێك پاڕانەوەی تێدا بووایە دەست بەجێ لەخوای پەروەردگار دەپاڕایەوە، ئەگەر باسی پەنا گرتن بوایە بەخوا، دەست بەجێ پەنای بەخوا دەگرت.

یەكێك لەهاوەڵان كە قەتتادەی كوڕی نوعمان بوو(خوای لێ ڕازی بێت) بەدرێژایی شەوێك شەو نوێژ كردن لەخزمەت خوادا تەنها ئایەتی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ی دەخوێندەوەو هیچی تری بۆ زیاد نەدەكرد.؟!!

سەعیدی کوڕی عوبەیدی تائی (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: گوێم لەسەعیدی کوڕی جوبەیر بوو کەلە مانگی ڕەمەزاندا پێش نوێژی بۆ موسڵمانان دەکردو ، بەدرێژایی مانگی ڕەمەزان،تەنها ئەم چەند ئایەتەی دووبارە دەکردەوە ئەویش کەخوای گەورە دەفەرمێت:

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾﴾ (الغافر: ٧٠، ٧١، ٧٢).

واتە: جا لە ئایندەدا پاشەڕۆژی خۆیان دەزانن، دەزانن جێ و ڕێیان دۆزەخ و واوەیلایە، کاتێ کۆت و زنجیر لەملیاندایە، بەو زنجیرانە ڕادەکێشرێن بەناو ئاوێکی گەرمداو، دەشکرێت بەگەروویاندا، لەپاشاندا لەناو ئاگردا گڕدەدرێن و دەسوتێنرێن، هاوڕێ لەگەڵ تەواوی پێست وگۆشت و ئێسقانیان.

هەروەها قاسم (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: شەوێکیان سەعیدی کوڕی جوبەیر شەو نوێژی دەکرد، زیاد لەبیست جار ئەم ئایەتەی دوبارە کردەوە کەخوای گەورە دەفەرمێت:

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾﴾ (البقرە: ٢٨١).

واتە: خەڵکینە لەسزای ڕۆژێك بترسن کەهەمووتان تێیدا ئەهێنرێنەوە بۆلای خوا، لەپاشان هەمو کەسێك پاداشتی کارو کردەوەی خۆی بەتەواوی دێتەوە ڕێ، وە ستەمیشیان لێ ناکرێت،

کەموکورتی لەچاکەکانیاندا ناکرێت و، زیادەش لەگوناهەکانیاندا نادرێـت بەکۆڵیاندا.

هاوەڵێك دەفەرموێت: شەوێك بـە میـوانی چـوومە خزمـەتی ئیمـام حەسەن، بەدرێژایی ئەو شەوە شەو نوێژی دەکرد، تانوێژی بەیانی هـەر بـەردەوام بـوو ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە کـەخوا دەفـەرمێت: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (ابـــراهیم: ٣٤).

واتە: ئەوانەش وا باسمان کردن بۆتان، هەندێك بوون لەنیعمەتـە بـێ ژمارەکانی خوا، خۆ ئەگەر ئێـوە بتانـەوێت نیعمەتـەکانی خـوا بـژمێرن، هەرگیز لەئـەژمار نایـەن بۆتـان، بەڕاسـتی مرۆڤـی لا ڕێ زۆر سـتەمکارو کوفر کەرو سپڵەیە. ئەو هاوەڵە دەفەرمێت کەڕۆژ بوویـەوە پرسـیارمان لەئیمام حەسەن کرد: بۆ ئەوەندە ئەو ئایەتەت دوبارە دەکردەوە؟

ئەویش لەوەڵامدا فەرموی: چونکە پەندو ئامۆژگاری زۆرم لەو ئایەتـە وەرگرتـووە، بەچـاو بەرزکردنـەوەو چـاو داخـستن تـەنهاو تـەنها هـەر نیعمەتی خوا دەهاتە پێش چاوم، ئای نیعمەتـەکانی خـوا چـەند زۆرن و ئێمە لێیان بێ ئاگاین و تەنها خوا خۆی دەیانزانێت.

هـەروەها هـاروونی کـوڕی ڕەبـاب (خـوای لێ ڕازی بێـت) شـەوێك هەسـتا بـۆ شـەو نوێـژ هـەتا نوێـژی بـەیانی بـە بـەردەوامی دەگریـاو

،بەردەوام ئەم ئایەتەی دوبارە دەکردەوە: ﴿فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾الانعام:٢٧.

واتە:ئای خۆزگە جارێکی تر دەگێڕدراینەوە بۆدونیا وباوەڕمان بەبەڵگەو ئایەتەکانی خوای گەورە دەکرد.

بەڵێ بێ گومان لەبەر کردنی قورئان و نزا جۆراو جۆرەکان و خوێندنیان لەنوێژداو ،بیرکردنەوە لەماناکانیان هۆکارێکە بۆ زیاتر وردبوونەوە و تێڕامان لەقورئان.

گومانی تێدا نیە کە تێڕامان و بیرکردنەوەو دوبارە کردنەوەی ئایەتەکان و کاریگەر بوون پێیان گەورەترینی ئەو هۆکارانەن کە ملکەچی دروست دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعًا﴾ (الاسراء: ١٠٩).

واتە: بۆ سوپاسی خوا بەچەناگەو دەمەو ڕوو دەکەون و کڕنووش دەبەن، وەلە ترسی خوا بەکوڵ دەگرین و فرمێسك لەچاویان دێت، هەتا دێ جار لەدوای جار ئەو قورئانە ملکەچییان زیاد دەکات و بەهۆیەوە پتر تەسلیمی فەرمانی خوا دەبن.

ئەمەی خوارەوە بەسەرهاتێکی کاریگەرە کە تێڕامان و ملکەچی پێغەمبەر (ﷺ) دەردەخات:

لە عەتائەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: من و عوبەیدی کوڕی عومەیر چووینە خزمەتی عائیشەی دایکی ئیمانداران (خوا لە هەموویان

ڕازی بێت) ،ئیبن عومەیر فەرمووی:ئەی دایكی ئیمانداران شتێكی سەرسوڕهێنەر كەلەپێغەمبەرت (ﷺ) دیبێت بۆمان بگێڕەوە، دایكە عائیشەیش دەستی كرد بەگریان و فەرمووی: شەوێكیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەخەو هەستاو فەرمووی: ئەی عائیشە ئایا لێم دەگەڕێیت كەمێك بچمە خزمەتی پەروەردگارم و پەرستشی بكەم؟ دایكی ئیمانداران بەردەوامە لە قسەكانی و پاشان فەرمووی: پێغەمبەر دەست نوێژی گرت و دواتر دەستی كرد بەنوێژ، پێغەمبەر لەناو نوێژەكەیدا ئەوەندە گریا هەتا بەردەمی بەفرمێسك تەڕبوو، بەردەوام بوو لەگریان تا بەفرمێسكەكانی زەویەكەی تەڕكرد!؟پاشان بیلال هات وبانگی نوێژی بەیانی فەرموو، كاتێك پێغەمبەری (ﷺ) بینی بەو شێوازە دەگریا،وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا ئەوە تۆی دەگرێیت لەكاتێكدا كەخوای گەورە لەتاوانی پاش و پێشت خۆش بووە؟!ئەویش (ﷺ) لە وەڵام دا فەرمووی: ئایا بەندەیەكی سوپاس گوزار نەبم؟ ئەمشەو لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ئایەتێكم بۆ دابوزیوە، هاوار بۆ ئەو كەسەی دەیخوێنێتەوەو لێی ورد نابێتەوەو ڕانامێنێت لەوەی كە تێیدایە؟!: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)﴾ (ال عمران: ١٩٠، ١٩١).

واتــە: بەڕاسـتی لــەو شـێوە دروسـت کردنــە سەرسـوڕهێنەرەی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵ و گۆڕی شەو و ڕۆژ، چەندین بەڵگەو نیشانەی پتەو هەیە لەسـەر بـوون و تـاك و تـەنیایی خـوای گـەورە، بۆکەسـانێك کەخاوەن ژیری و هۆشمەندین، ئەو کەسانەی کەبە پێوەو بەدانیشتن و لەسـەر تەنیـشت و ڕاکـشان یـادی خـوا دەکـەن، لەدروسـت کردنـی ئاسمانــەکان و زەوی ڕادەمێــنن و بــیر دەکەنــەوەو دەڵــێن، ئــەی پەروەردگاری ئێمە، هەرگیز تۆ ئەم دروست کراوە پڕ لە وردەکاریەت بێ هـودەو بـێ ئامـانج دروسـت نـەکردووە، تـۆ لەهـەمو ناتەواویـەك پـاك ڕادەگرین، دەسا تۆیش لەسزای ئاگر بمانپارێزە.

خاڵێکی تر کەپێویستە ئاماژەی پێ بدەین ئـەویش (ئـامین) کردنـە، لەکۆتایی سورەتی فاتیحەدا:

لەم بارەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرمێت: ﴿إذا أمن الأمـام فأمِّنــوا، فانّــه من وافــق تأمينه تأمين الملائكة غفـر له ما تقـدّم مـن ذنبه﴾.

واتە: کاتێك ئیمام ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکـەن، چـونکە ئـامینی هەرکەسێك لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا یەك بگرێتەوە خوا لەگوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

هـەروەها وەلاّم دانـەوەی پـێش نوێـژ کاتێـك دەڵێـت (سَمِعَ الله لِمَنْ حمده ) وەمەئمومەکانیش دەڵـێن (ربّنـا ولـك الحَمْـد ) ئـەوە پاداشـتێکی گەورەی تێدایە، لـەم بـارەوە ڕەفاعـەی کـوڕی ڕافعـی زەرقـی(خـوای لێ

ڕازی بێت) دەفەرمێت: ڕۆژێکیان نوێژمان لەپشت سەری پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکرد، کاتێك سەری لەڕکوع بەرز کردەوەو فەرمووی: (سمع الله لمن حمده)، پیاوێك لەدواوە وتی: (*ربنا ولك الحمد حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه*).

کاتێك لەنوێژ بووینەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کێ بوو ئەوەی وت؟

پیاوەکەش فەرمووی:من بووم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ﴿رأيت بضعة وثلاثين ملكا يبتدروها أيهم يكتبها أول﴾.

واتە: سی و ئەوەندە فریشتەم بینی دەست پێشخەرییان دەکرد کە کامیان یەکەم جار بینوسێت.

پرسیار:

سەبارەت بەڕامان و ورد بوونەوە لەقورئان باسی ئەوەمان کرد کەپێویستە موسڵمان هەوڵ بدات لەقورئان تێ بگات و لەماناکەی ورد بێتەوە، بۆ ئەوەی لەنوێژەکەی دا ملکەچ بێت، زۆر ئەم پرسیارە دەکرێت ئێمە وەك گەلی کوردی موسڵمان کەسێکی ڕۆشنبیر یان بەپێچەوانەوە کە عەرەبی نازانێت پرسیار دەکات و دەڵێت: من کەعەرەبی نازانم و لە مانای قورئان تێ ناگەم چی بکەم بۆ ئەوەی ملکەچی لەنوێژەکەمدا هەبێت...؟

وەڵام:

سەبارەت بەهەموو ئـەو گەلانـەی كـە موسـڵمانن و لـە عـەرەبی تـێ ناگەن ، بەشێوەیەكی گشتی و گـەلی كـوردیش بەتایبـەتی، هـەر یـەكێك لەئێمە ئاسـتی ڕۆشـنبیری لەهـەر پلەیەكدا بێـت، خوێنـدەوار بێـت یـان نەخوێندەوار، پێویستە لەسـەری بـەپێی توانـا هـەوڵ بـدات كەلـە مانـاو واتـای ئـەو زیكـرو قورئـان خوێندنـە تـێ بگـات كەلـە كـردارە جـۆراو جۆرەكانی نوێژدا دەخوێندرێن، چونكە فێربوون و تێگەیـشتن لـەقورئان ئەگەر بمانـەوێت لەواتاكـەی تـێ بگـەین ئەوەنـدە كـارێكی قـورس نیـە، تەنانەت بۆ ئەو موسڵمانانەش كە نەخوێنـدەوارن، ئەمـە كـەی گونجـاوە موسڵمانێك (چل ساڵ، پەنجا ساڵ، شەست ساڵ،حەفتا سـاڵ) یـا زیـاتر ڕۆژانە حەڤدە جار سورەتی فاتیحە بخوێنێتەوەو لەماناكەی تـێ نـەگات ،یاخود لە (سبحان ربي العظيم) تێ نەگات؟! نەزانێ لـەكڕنووش بردنـدا چی وتووە؟! هەروەها واتاو مانای ئەو وتوو وێـژەی كەلـە نێـوان خـواو پێغەمبەرو فریشتەكاندا ڕووی داوە مەبەستمان (تەحییات) ە نـەزانێت و نەتوانێت لەماناكەی تێ بگات؟! بەكورتی و پوختی ئەو كەسانەی كەلـە قورئان و ویردەكانی ناو نوێژ تێ ناگەن خوێندەوارین یـان نەخوێنـدەوار پێویستە هەوڵ بدەن بە پێ ی توانا لەماناكەی تێ بگەن، چونكە ئەگـەر نوێژ بریتی بێت لـەدارێكی سـەوز ئـەوا بـێ گومـان بەرهەمەكـەی بریتیـە لەملكەچی، بەبێ تێگەیـشتن لـەماناو واتـای ئایـەت و ویردەكـانی نوێـژ،

ملكەچـی دروسـت نابێت،ئاشـكرایە بـەبێ ملكەچـیش هـیچ چـێژێك لەنوێژەكانمان وەرناگرین.

بەپشتیوانی خوای گەورە لەكۆتا بەشی ئـەم پەرتووكـەدا پوختـەی تەفسیری سورەتی "الفاتحە" و چەند سورەتێكی كورتی قورئان و واتاو مانـای هەنـدێك لـەزیكرەكانی كـرداره جیاوازەكـانی چـەمینەوەو هەسـتانەوەو كڕنـووش و......هتـد و پوختـەی بـەكوردی كـراوی (تەحییات) بەزمانی شیرینی كوردی دەخەینە ڕوو.

## ٥) جیاكردنەوە لەخوێندنەوەی ئایەتەكانداو وەستان لەسەریان:

ئەمـەش ئاسـانترە بـۆ تێڕامـان و ورد بوونـەوەو تێگەیـشتن لـەماناو نـاوەڕۆكی ئایەتـەكان، هـەروەها سـوننەتێكی پێغەمبـەری خوایـشە (ﷺ)،لەم بارەوە ئوم سەلەمە(خـوای لێ ڕازی بێـت) شـێوازی قورئـان خوێندنی پێغەمبەری ئازیزمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت:

قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم شێوەیە بوو:

(بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، پاشان كەمێك دەوەسـتاو دەیفـەرموو: (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)، دواتـر كـەمێك دەوەسـتاو پاشـان دەیفـەرموو (ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، پاشی كەمێك چاوەڕوانی تـر ئینجـا دەیفـەرموو (مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ) ...بەو شێوازە واتە ئایەتەكانی لەیەكتر جیا دەكردەوە، كـە ئەمەش بێ گومان مرۆڤ بەرەو بیركردنەوە لە واتای ئایەتەكان دەبات.

لەسەرەتاوە ئاماژەمان بەوەدا کەنوێژ واتای گفتوگۆو موناجات لەگەڵ خوای گەورەدا دەگەیەنێت، کەمن لەنوێژدا دەڵێم سوپاس بۆ پەروەردگاری هەمو جیهانیان دەبێت لەناخەوە دڵنیابم کەخوای گەورە وەلآمم دەداتەوەو دەفەرمێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، بەو شێوازە بۆ خوێندنەوەی ئایەت و ویردەکان لەنوێژدا پێویست بەوە دەکات کەمێك لەسەر ئایەتەکان و ویردەکان بوەستین و بەخێرایی بەسەریاندا تێ پەڕ نەکەین.

## ٦ ) جوان خوێندنەوەی قورئان و ڕازاندنەوەی بەدەنگی خۆش:

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ (المزمل: ٤). واتە: زۆریش بە ئاهستەو لەسەرخۆ و ڕێك و پێك ئەم قورئانە بخوێنەرەوە با لە دڵتدا جێگەی خۆی بکاتەوە.

هەروەك پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا هەوڵی داوە وشە بە وشە لەسەریان بوەستێت و لەماناو ناوەڕۆکەکەیان ورد بێتەوە.

پێویستە بزانین کە لەسەر خۆو جوان خوێندنەوەی قورئان زیاتر دڵەکان کەمەند کێش دەکات، بۆ تێڕامان و بیرکردنەوەو ملکەچی، بەپێچەوانەوە خێرا خوێندنەوەی قورئان وادەکات کە مرۆڤ هیچ تام و چێژێکی دەروونی لەخوێندنەوەی قورئانەکە نەبینێت.

بێ گومان هۆکارێکی گرنگ بۆ ملکەچ بوون لەنوێژدا بریتیە لەخوێندنەوەی قورئان لەنوێژداو بەدەنگی خۆش ڕازاندنەوەی، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿زينوا القرآن بأصواتكم، فإن الصوت الحسن يزيد القرآن حسنا﴾.

واتە: قورئان بڕازێننەوە بەدەنگە خۆشەکانتان، چونکە دەنگی خۆش قورئان جوانتر دەکات.

وە تەنها مەبەست ئەوە نیە کەدەنگت خۆش بێت و بەس، بەڵکو جوانی دەنگ لەوەدایە کاتێك قورئانەکە دەخوێنیتەوە،هەست بەوە بکەیت کە ترسی خوای گەورەت لە دڵدایە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿إنّ من أحسن الناس صوتاً بالقرآن الذي إذا سمعتموه يقرا حسبتموه يخشى الله﴾.

واتە: بەڕاستی دەنگ خۆشترین کەس لەناو خەڵکیدا کەقورئان دەخوێنێتەوە ئەو دەنگەیە ئەگەر گوێ بیستی بوون کاتێك دەیخوێنێتەوە، واگومان دەبەن کەخاوەنەکەی لەخوا دەترسێت. ئەم فەرموودە لاوازە، بەڵام فەرموودەی تر سەبارەت بەدەنگی خۆش و فەزڵەکەی هەیە.

**٧) وا بزانی کە خوای گەورە لەنوێژەکەتدا وەڵامت دەداتەوە:**

لەم بارەوە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿قال الله عزّ وجل: قسمت الصّلاة بيني وبين عبدي نصفين ولعبدي ما سأل: فإذا قال العبد: الحمد لله رب العالمين، قال الله: حمدني عبدي، فإذا قال: الرحمن الرحيم، قال الله: أثنى علي عبدي، فإذا قال: مالك يوم الدّين، قال الله: مجدني عبدي، فإذا قال: إياك نعبدُ وإيّاك نستعين، قال هذا بيني وبين عبدي ولعبدي ما سأل، فإذا قال: إهدنا الصراط المستقيم، صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولاالضالّين، قال الله: هذا لعبدي ولعبدي ما سأل﴾.

واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: نوێژم لەنێوان خۆم و بەندەکەم دا بۆ دوو بەش دابەش کردووە ، بەندەکەم هەر پرسیار گەلێك بکات با وەڵامی بدەمەوە، کاتێك بەندە دەڵێت: هەمو سوپاس و ستایشێك تایبەتە بەخوای جیهانیان، خوای گەورە دەفەرمێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، وەکاتێك بەندە دەڵێت: بەخشندەی میهرەبان، خوای گەورە دەفەرمێت: بەندەکەم نیعمەتەکانی نرخاندم، کاتێك بەندە دەڵێت: خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە، خوای گەورە دەفەرمێت: بەندەکەم بەرزو پیرۆز ڕایگرتم، کاتێك بەندە دەڵێت: خوایە تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین، خوای گەورە دەفەرمێت: ئەمە لەنێوان من و بەندەکەم دایە، بۆی هەیە هەرچیەك داوا

بکات، کاتێك بەندە دەڵێت: ڕێنموییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست، ڕێگای ئەوانەی کەچاکەت لەگەڵ کردوون، نەك ڕێی ئەوانەی کەخەشم و قینی تۆیان لیٚ گیراوەو نەك گومڕا بووەکان، خوای گەورە دەفەرمێت: ئەمە بۆ بەندەکەمەو،بۆبەندەکەم هەیەهەرچی داوابکات.

لە ڕوانگەی ئەم فەرموودە پیرۆزەوە دەبێت بزانین کەنوێژ واتە گفتووگۆ کردن لەگەڵ زاتی پیرۆزی (الله) ، ئەگەر بەو شێوازە نوێژمان کرد ئەوا نوێژەکە بەملکەچییەکی تەواوەوە ئەنجام دەدەین و ،پاشانیش ئەو نوێژە دەروونمان بەرەو ڕۆخی ئارامی و دڵنیایی و متمانە بوون بە پەروەردگارمان دەمانبات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿إن أحدكم إذا قام يصلي فإنّما يناجي ربّه، فلينظر كيف يناجيه﴾.

واتە: ئەگەر یەکێکتان هەستا نوێژ بکات بابزانێت کەخوای گەورە بانگ دەکات و داوای لیٚ دەکات، دەبزانن چۆن داوا لەخوا دەکەن.

### ٨ ) نوێژ کردن لەنزیك بەربەستەوە ( الستر ):

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دانانی بەربەست لەبەردەم نوێژ خوێندا، هۆکارێکی زۆر بەسوودە بۆ ملکەچ بوونی زیاتر لەنوێژدا، چونکە بەربەست ماوەی ڕووانین و سەیرکردن کەم دەکاتەوەو،هەمان کات نوێژخوێنیش لە فێڵی شەیتان دەپارێزێت، هەروەها بەربەست ڕێگریشە لەوەی خەڵکی بە بەردەم نوێژ خوێندا هاتووچۆ بکات، بیٚ

گومان هات و چۆكردن بەبەردەم نوێژ خوێندا،سەر ئەنجام دەبێتە هـۆی خەریك كردنی نوێژ خوێن و بیٚ ئاگا كردنی لەنوێژەكەی، سەرەڕای كـەم بوونـەوەی پاداشـتەكەی كەئەمـەش ئـاواتی گـەورەی شـەیتانە، جگـە لەوەش نزیكی لەبەر بەستەوە سـودێكی گـەورەی هەیـە وەك پێغەمبـەر (ﷺ) ئاگادارمان دەكاتەوەو دەفەرمێت: ﴿اذاصلی احدكم إلی سـتـرة فـلـيـدن منـهـا لا يـقـطع الـشيطان عليه صلاته﴾.

واتە: كاتێك يەكێك لە ئێوە لەلای بەربەستدا نوێژی كرد با لێی نزیك بێتەوە،چونكەشەيتان ناتوانێت نوێژەكەی بپچڕێنێت.

سوننەتە ماوەی نێوان بەربەست و نوێژ خوێنەكە سـیٚ زیـراع بێـت، وەك لـە فـەرمودەی صـەحیحدا هـاتووە: بـا مـاوەی هاتووچـۆی مـەڕێك ببێت، هەروەها پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئاگادارمـان دەكاتـەوە كەڕێگـە نەدەین كەس بە بـەردەم نوێژەكەمانـدا بـڕوات و ڕێگـری لیٚ بكـەین،وەك دەفەرمێت:﴿اذاكان أحـدكـم يصـلـي فلا يـدع أحـداً يـمـرّبيـن يديـه، وليـدرأه ما استطاع، فإن أبـی فلـيـقاتلـــه فـان معـــه القرين﴾.

واتە: ئەگـەر يـەكێك لـە ئێـوە نوێـژی كـرد، بـا ڕیٚ نـەدات كـەس بـە بەردەم نوێژەكەيدا بڕوات،هەتا ئـەتوانێت دووری بخاتـەوە، ئەگـەر هـەر ويـستی بـە بـەردەم نوێژەكەتـدا بـڕوات بـەرەنگاری ببـەرەوە تەنانـەت ئەگەر هاوڕێشت بێت.

بەلآم بەڕای بەندە ئەگەر منداڵ بەبەردەم نوێـژدا تـێ پـەڕی کـرد، باشتر وەهایە لە پـاش نوێژەکـە تـەمێ بکرێـت و پێـی بوترێـت، چـونکە حەسەنەین بەبەردەم نوێژی ئازیزماندا تێ پەڕیان دەکردو، دەشـچوونە سەر ملی وازی لێ دەهێنان و دووری نەدەخستنەوە.

هــەروەها ئیمــامی نــەوەوی (خــوای لێ ڕازی بێــت) لــە بــارەی بەربەستەوە دەفەرمێت: حیکمەت لە بەربەستی نوێژ، گرتنـەوەی چـاوە لـە ڕووانـین بـۆ دوور، هــەروەها ڕێگرتنــە لەشــەیتان کەهــەوڵ دەدات نوێژەکە لە نوێژخوێن تێك بدات.

## ٩) دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەسەر سینگ:

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کاتێك نوێـژی دەکـرد، دەسـتی ڕاسـتی دەخــستە ســەر دەســتی چــەپی و لەســەر ســنگی دایــدەنان، وەك دەفـەرمـێت: ﴿إنّـا مـعــشـر الأنبيــاء أُمــرنا أن نـضع أيمــاننا علـــى شمـائلنا فـي الصـلاة﴾.

واتــە: ئێمــەی کۆمــەڵی پێغەمبــەران فــەرمانمان پــێ کـراوە بــەدانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەئەنجام دانی نوێژدا.

هـەروەها ئـیبن حەجـەر (خـوای لێ ڕازی بێـت) لـەزاری زانایانــەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت: حیکمەتی ئەم شێوە دەست گرتنە لەوەدایـە، کەئەمەسیفەتی کەسێـکی داواکاری لاوازو بێ توانایە لـە بـەردەم خـوای گەورەو بە توانادا، بەو شێوەیە نوێژ خوێن لەهەموو جوڵەیەکی نابـەجێ

دوور دەكەوێتەوە،هەروەها ئەم شێوە دەست گرتنــە زۆر زۆریـش نزیكـە لەملكەچیەوە.

### ١٠) سەیركردنی شوێنی كڕنووش؛

لەدایكی ئیماندارانەوە عائیشە(خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـە فەرمویــەتی: پێغەمبــەر (ﷺ) لــەكاتی نوێژكردنداســەری دادەنەوانــدو ئاڕاستەی بینینی چاوی بـەرەو زەویەكـەو شـوێنی كڕنووشـەكەی بـوو، كاتێكیش دادەنیشت بۆخوێندنی (تەحییات) بەردەوام هێمای بەپەنجەی شایەتومانی دەكردو چاوی لێ لانـەدەدا ولـەكاتی شـایەتوماندا پەنجـەی درێژ دەكردو بەچاوەكانی بەردەوام سەیری دەكرد.

لێرەداپێویستەئاماژەبەپرسیارێك بكەین كەدێت بەمێـشكی زۆربـەی نوێژخوێناناو دەپرسن و دەڵێن:حـوكمی چـاو نوقانـدن لەنوێـژدا چـیە؟ بەتایبەت كەنوێژخوێن بەچاو نوقاندن زیـاتر هەسـت بـەئارامی دەرروونـی دەكات و واهەسـت دەكـات كەچـێژێكی زۆرلـەو چـاو نوقاندنـە دەبینێـت لەنوێژدا؟

وەڵام: ئەمــە پێــچەوانەی كــردارو ڕەفتــارو ســوننەتی شــیرینی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، وەك پێشتر ئاماژەمـان پێـدا؟! چـونكە چـاو نوقاندن و چاو پۆشین مـاوەی سـەیركردنی شـوێنی سـوجدەو پەنجـەی شایەتومان نادات.

لـەم بـارەوە ئـەبو عەبـدوڵڵای ئیبنولقـەییم (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفەرمێت: پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) چاوی نەنوقانـدووە لەنوێـژدا، لەكاتی شایەتیداندا پەنجەی درێژ دەكردو بەچاو سەیری دەكردو چاوی لەئیشارەتی پەنجەی لانەدەدا.

ئەم بەڵگانەش سەلمێنەری نادرووستی چاو نوقاندنن: كاتێك لەنوێژی خۆرگیراندا پێغەمبەر (ﷺ) بەهەشتی بینیوەو دەسـتی درێـژ كـردووە بۆ ئەوەی هێشویەك ترێ لێ بكاتـەوە، وە ئـاگری دۆزەخـی بینیـوە كـە پـشیلەیەكی تیـا بـووە،وە فـەرموودە هەیـە كـە بـاس لـەوە دەكـات پێغەمبەری خوا ئەو ئاژەڵەی دەركردووە كەویستویەتی بەناو دەستیدا تێپـەڕ ببێـت، جگـە لـەوەش فـەرموودە هـاتوە كەپێغەمبـەر (ﷺ) بـە ئاماژەكردن وەڵامی سەلامی داوەتەوە لەكاتی نوێژ كردندا، هەروەها لـە فەرموودەیـەكی تـردا هـاتووە كـە بـە چـاوی خـۆی شـەیتانی بینیـوەو خنكاندوویەتی.. ئەم فەرموودانە و چەندین فـەرموودەی تـریش بەڵگـەن لەسەر ئەوەی كەپێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژدا چاوی نەنوقاندووە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا فوقـەهاكان لـەم بـارەوە بـیرو ڕایـان جیـاوازە، سەبارەت بەناباشی چاو نوقاندن لە نوێژدا، ئیمام ئەحمەدو جگە لەویش بەلایانەوە ناباشە كەدەڵێن: ئەمە كاری جولەكەیە، لەلای هەندێك زانـای تریش ڕێ پێدراوەو ناباش نیە، كەواتە دروستە كە بوترێـت ئەگـەر چـاو بكرێتەوە لەنوێـژدا ئـەوا ئـەو نوێـژە بێبـەش نابێـت لـە ملكەچـی و ئـاوا

باشـترە، بـەڵام ئەگـەر لەبـەردەم نوێـژ خوێنـدا زەخـرەف و نـەخش و نیگاری ڕازاوەو شتی لەو بابەتە هەبوو کەببێتە هۆی سەر لێ شـێواندنی نوێژ خوێن لە نوێژەکەیی و سەرنج ڕاکێشانی ئـەوا هـەرگیز نابـاش نیـە چاو بنوقێنرێت، بەپێی ئوصـول و مەبەسـت واباشـترە چـاو بنوقێنرێت هەتا بکرێتەوە (و الله أعلم).

## ١١) جوڵاندنی پەنجەی شایەتومان:

ئـەم کـارە لەلایـەن زۆربـەی نوێـژ خوێنانـەوە پـشت گـوێ خـراوە، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ بـێ ئاگـایی ونـا شـارەزاییان لەسـودەکانی جوڵاندنی پەنجە لەکاتی شـایەتوماندا، کـە بـێ گومـان پەنجـە جوڵانـدن کاریگەری زۆری هەیەو هاندەری سەرەکی مرۆڤی موسڵمانە هـەتا تـام و چێژ لە نوێژەکەی وەربگرێت وبە خشوعەوە ئەنجامی بدات؟! چونکە تـۆ بە پەنجە جوڵاندنت بەڵێنی یەك خواپەرستی ودژایـەتی کردنـی شـەیتان نوێ دەکەیتەوە.

لەبەر ئـەوە یـەکێك لەوکردەوانــەی کـە زۆر ئـازاری شـەیتان دەدات جوڵاندنی پەنجەیە لەکاتی شایەتوماندا.

هەر لەم بارەوە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرمێت: ﴿لـهي أشـدّ علی الشیـطان من الـحدیـد﴾.

واتــە: ئەوپەنجەجوڵاندنـەئازاری زۆرزیاترونارەحـەت وسـەختترە لای شەیتان لەئاسن کەبیدەی بەسەرکەسێکدا.

لەڕاستیدا پەنجە جوڵاندن ماناو واتایەکی بەربڵاوی هەیە کە ئەویش بریتی یە لە تەوحیدو بە تاك گرتنی خوای کار بەجێ،نوێژ خوێن بەو پەنجە جوڵاندنەی تاقانە پەرستی خوای گەورە دوپات دەکاتەوەو بەڵێنش بۆ بەردەوامی دان بەو کاروانە نوێ دەکاتەوە.

هەر لەم ڕوانگەیەوە سەبارەت بەگەورەیی پەنجە جوڵاندنی کاتی شایەتومان لەنوێژدا، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری یەکترییان دەکردو زیاتر پێداگر دەبوون لەسەر جێبەجێ کردنی و وەپەیمانیان ئەدا کە هەرگیز وازی لێ نەهێنن، بەڵام لەم سەردەمەی خۆماندا زۆر بەداخەوە لەناو نوێژ خوێناندا پەنجە جوڵاندن زۆر پشت گوێ خراوەو بێ ئەرزش سەیر دەکرێت.

هەروەك لە (ئەسەر) یشدا هاتوە کەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لەیەکترەوە فێر دەبوون کەپەنجەی شایەتومان بجوڵێنن لەکاتی شایەتوماندا.

## ١٢) هەمەچەشنی لەو سورەت و ئایەت و ویردوو پاڕانەوانەی کەلە نوێژدا دەخوێنرێن:

بێ گومان ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری هەیە بە ئاڕاستەی بەدی هاتنی خشوع لە نوێژدا، هەمان کات زیاتر نوێژ خوێن هەست بەنوێ بوونەوەی ماناو واتای ئایەتەکان دەکات و، پتر چێژ لەو ئایەت و ویردانە وەردەگرێت کەلە نوێژەکەیدا دەیان خوێنێت؟! چونکە بەڕێزان

یەكێك لەموعجیزە سەرسوڕهێنەرەكانی قورئان ئەوەیە كەخوێنەر هەتا زۆرتر لەگەڵ قورئاندا بژی لێی بێزار نابێت، بەتایبەت ئەگەر ئەو كەسە لەماناو واتای قورئان تێ بگات، هەر لەبەر ئەمەشە كەهەندێك جار گوێت لە ئایەتێك دەبێت هەستێكی ئەوەندە گەورەت پێ دەبەخشێت وەك ئەوە وەهایە كە یەكەم جارت بێت گوێت لێی بوبێت،لەڕاستیدا لەوانەیە پێشتریش لەبەرت بوبێت! ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە وەك موعجیزەیەك زۆر خوێندنەوەی قورئان هیچ كات گوێگرە ڕاستەقینەكانی قورئان بێزار ناكات، بەڵكو هەتا گوێی لێ بگرێت زیاتر دڵە زیندووەكەی ئارام دەگرێت و داوای زیاتر خوێندنەوەی قورئان دەكات، ناوی قورئانیش لەزۆر خوێندنەوەوە هاتووە كە بە درێژایی مێژوو هیچ پەڕاوێك نیە ئەوەندە بخوێندرێتەوەو بدرێت بەگوێی مرۆڤایەتیدا.

ئەمە جگە لەوەی كە گوێ گرتن لەقورئان دڵەكان ئارام دەكاتەوە، زۆرن ئەو خەڵكانەی كە بەرەو ئیسلام دەگەڕێنەوە، لەئاینە جیاوازەكانی وەك (مەسیحی و جولەكەو...هتد) ، لەزمانە جیاوازەكانی دونیا، كاتێك كە لە ڕاگەیاندنەكانەوە پرسیار لەهۆكاری موسڵمان بوونیان دەكرێت؟! ڕاستەوخۆ لەوەلاّم دا دەڵێن كاریگەری قورئان لەسەر دڵ و دەروونمان هۆكاری موسڵمان بوونمان بوو، ئەمە لەكاتێكدایە كەزۆربەیان زمانی عەرەبیش نازانن! بەلاّم بەداخەوە لەم سەردەمەی خۆماندا نوێژ خوێنان زیاتر سەرگەرمن بەخوێندنەوەی

سـورەتە كورتـەكانى قورئانـەوە لەنوێـژدا، تەنانـەت لاى هەنـدێكمان خوێندنەوەى سورەتە كورتەكانى (فلق، النـاس، الكـوثـر...) لەنوێـژدا وەك خوێندنەوەى سورەتى (الفاتحە)يە لەنوێژدا، واتە وەك خوويەك بە بەردەوامى سورەتە كورتەكان لەنوێژدا دەخـوێنين وەك چـۆن سـورەتى (الفاتحـە) پێويـستە بخوێنرێت،بەهـەمان شـێوە لەسـەر خـۆشمان پێويست كردووە كە سورەتە كورتەكان بە بەردەوام بخوێنين.

ئەم دياردەيەى كەباسمان كرد بـە داخـەوە هەنـدێك لـەو كەسانەش دەگرێتەوە كە قورئانيـان لەبەرەو،هـەمان كـات لەخوێندنـەوەى ويـردوو نزاو پاڕانەوەكانيشدا بەهەمان شێوە پەنا بۆ نزا كورتەكان دەبەن.

پێويـستە بـزانين هەمـە چەشـنى لەخوێنـدنى ئايـەت و ويردەكانـدا هۆكارێكى گەورەيە بۆ ملكەچى نواندن لەنوێژدا، وا لە خوارەوەش چەند نمونەيـەك دەخەينـە ڕوو لـەو نـزاو پاڕانەوانـەى كـە پێغەمـبەر (ﷺ) لەنوێژەكانيدا خوێندويەتى:

*نـزاى كـاتى دەسـت پێكردنـى نوێـژ: ﴿اللّهـمّ بـاعـد بـيني وبـين خـطايـاي كـمـا بـاعـدتَّ بيـن المشرق والـمغـرب، اللهم نقني من خطايـاي كمـا ينقـى الثـوب الابـيض مـن الدَّنـس، اللّهـمّ اغـسلنى مـن خطاياى بالثلج والماء والبرد﴾.

واتـە: خوايـە نێـوان مـن و گوناهـەكانم دوور بخـەرەوە، وەك چـۆن ماوەى ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوات دوور خستەوە، خوايـە گيـان لەگوناهـەكانم

پاكم بكەرەوە هەروەك چۆن كراسی سپی له چڵك پاك دەبێتەوە، خوایه لەگوناهەكانم بمشۆرەوە به بەفرو باران و تەرزە.

* هەروەها ﴿ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله ربِّ العامين﴾

واتە: بەڕاستی نوێژو سەربڕین و ژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانه.

ئەو سورەتانەش كەپێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی بەیانیدا خوێندویەتی ژمارەیان زۆرە لەوانە سورەتە درێژەكان وەك (الواقعة، الطور، ق)، سورەتە كورتەكانیش وەك (تكوير، الزلزلة، فلق، الناس).

وە له پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە كەسورەتی (الروم، يس، الصافات) يشی خوێندووەتەوە.

وەله نوێژی نیوەڕۆدا وەك گێڕدراوەتەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەهەردوو ڕكاتی یەكەم دا لەهەر ڕكاتێكدا بەئەندازەی سی ئایەت قورئانی خوێندووەتەوە، ئەو سورەتانەش كەلە نوێژی نیوەڕۆدا دەیخوێندنەوە وەك (طارق، البروج، الليل).

لەنوێژی عەسریشدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەردوو ڕكاتی یەكەمو دووەمدا لەهەر ڕكاتێكدا بەئەندازەی پانزە ئایەتی خوێندووەتەوە، زیاتر ئەو سورەتانەی خوێندووەتەوە كەلە نوێژی نیوەڕۆدا دەیخوێندنەوە.

وەلــە نوێــژی مەغریبــدا ســورەتە كورتــەكانی وەكــو (الــتين) ی خوێندووەتــەوە هــەروەها ئــەم سورەتانەشــی خوێندووەتــەوە (محمــد، طور، مرسلات، ق).

وە لە نوێژی خەوتنانیشدا سورەتە مام ناوەندەكانی (الشمس، إذا السماء انشقت، التين، القدر)ی خوێندووەتــەوە، هــەروەها فــەرمانی بــە موعازیش كرد كە (الاعلی، القلم، الليل) بخوێنێتەوە.

هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) لەشەو نوێژدا زیاتر سورەتە درێژەكانی دەخوێنــدەوە، وەك گێڕدراوەتــەوە ســەد ئایــەت ،ســەد ئایــەت و پــەنجا ئایەتی دەخوێندەوە.

وەنــزای چــەمینەوەكان جــۆراو جــۆرە كــە پێغەمبــەر (ﷺ) خوێندوویەتی وەك: ﴿سبوح قدوس ربنا ورب الملائكة والروح﴾.

واتە: خوایە تەسبیحات و پیرۆزی هەر بــۆ تۆیــە ئــەی پــەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری فریشتەكان و جبریل.

﴿اللهم لك ركعت وبك امنــت ولــك أسـلمت وعليـك توكلــت أنــت ربـي، خشع سمعي وبصري ودمي ولحمي وعضمي وعـصبي لله رب العـالمين﴾.

واتە: خوایە بۆ تۆ چەمیمەوەو ئیمانم بەتۆ هێناو تەسـلیمی تــۆ بــووم و بیــستن و بینیــنم و مــۆخ وخــوێن و ئێــسقان و دەمــارو هــەموو ئــەم جەستەیەم كەقاچەكانم هەڵیان گرتووە ملكەچی تۆ بوون.

وە نزاى هەستانەوە لەچەمینەوەكان وەك: ﴿حمداً كثيراً طيِّباً مباركاً فيه ملء السّموات وملء الأرض وما بينهما وملء ماشئت من شيءٍ بعد﴾.

واتە:سوپاس وستایشێكى زۆروپاك وپڕبەرەكەت پڕ بەئاسمانەكان و پڕ بەزەوى و پڕ بەنێوانیان، وەپڕ بەو شتەى كەجگە لەمان بتەوێت. چەندین نزاى تریش....

نزاى كڕنووشەكانیش وەك: ﴿اللهم لك سجدت وبك امنت ولك أسلمت سجد وجهي للذي خلقه وصوره وشقّ سمعه وبصره تبارك الله احسن الخالقين﴾.

واتە: خوایە كڕنووشم بۆ تۆ بردوو باوەڕم بەتۆ هێناو تەسلیمى تۆ بووم، ڕووم كڕنووشى برد بۆ ئەو خوایەى كە بەدى هێناوەو وێنەى كێشاوەو بیستن و بینینى بۆ داڕشتووە، پاكى و بێگەردى بۆ (الله) ى چاكترینى بەدیهێنەران. چەندین نزاى تریش...

نزاى دانیشتنى نێوان دوو كڕنووشەكە وەك: ﴿اللهم اغفرلي وأرحمني واجبرني وارفعني واهدني وعافني وارزقني﴾.

واتە: خوایە لێم خۆش بە، بەزەییت پێمدا بێتەوەو ڕێنماییم بكە، ناتەواوى و كەم و كورتیم تەواو بكە، پارێزراوو لەش ساغم بكە، ڕۆزیم بدەو پلەم بەرز بكەرەوە.

## ١٣) کڕنووشی قورئان خوێندن کاتێك دەگەیتە ئایەتێك کە کڕنووشی تێدایە:

یەکێك لەڕەوشتەکانی خوێندنی قورئان ئەوەیە کاتێك دەگەیتە ئایەتێك کەفەرمانی کڕنووش بردنی تێدابوو دەست بەجێ کڕنووش ببەیت؟! چونکە خوای گەورە وەسف و ستایشی پێغەمبەران و پیاوچاکان دەکات و دەفەرمێت:

﴿إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ (مریم: ٥٨)، واتە: ئەمانە هەر کات ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا دەخوێندرایەوە ،بەپەلە دەمەو ڕوو دەکەوتنە سەرخاك و کڕنووشیان دەبردوو دەم بەکوڵی گریان دەبوون.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە پێغەمبەران پتر لەخەڵکانی دی لە خوای خۆیان دەترسن و دەیناسن.

هەر سەبارەت بەکڕنوشی قورئان خوێندن ئیمامی ئیبنولکەسیر(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: (أجمع العلماء على شرعية السُّجود هاهنا أقتداء بهم واتباعاً لمنوالهم).

واتە: زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لەسەر ڕەوایی و شەرعی بوونی کڕنووش بردن، لەو جێگایانەی کەکڕنووشی قورئان خوێندنی تێدایە وەك پێ هەڵگرتنی پێشینان.

هەروەها كڕنووشی قورئان خوێندنەوە پاداشتی گەورەی لەسەرەو هۆكاریشە بۆ زیاد بوونی ملكەچی لەنوێژدا،لەم بارەوە خوای گەورە دەفەرمێت:﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ (الاسراء: ١٠٩)، واتە: بۆ سوپاسی خوا بەچەناكەو دەمەو ڕوو دەكەون و كڕنووش دەبەن، وەلە ترسی خوای گەورە بەكوڵ دەگرین و فرمێسك لەچاویان دێت، هەتا دێ جار لە دوای جار ئەو قورئانە ملكەچییان زیاد دەكات و پتر تەسلیمی فەرمانی پەروەردگار دەبن.

وە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) جێگیر بووە كە لە نوێژەكەیدا كڕنووشی لە سورەتی (النجم) دا بردوە.

هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: ئەبی ڕافیع (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: لەگەڵ ئەبو هورەیرە نوێژی خەوتنانم دەكرد، لەناو نوێژەكەیدا ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾﴾ ی خوێندەوەو كڕنووشی برد،پاش سەلام دانەوەی نوێژ پێم وت: ئەبو هورەیرە بۆچی ئەوكڕنووشەت برد خۆ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾﴾كڕنووشی تێدانیە؟ ئەبو هورەیرە لە وەڵامدا فەرمووی: لەپشت پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كڕنووشم بردووەو بەردەوامی ئەو كڕنووشە دەبەم تا دەگەمەوە خزمەتی.؟!

لەبەر ئەوە پێویستە گرنگی بدەین بەجێ بەجێ كردنی كڕنووشی قورئان خوێندنەوەو پارێزگاری لێ بكەین، بەتایبەت كە كڕنووشی خوێندنەوەی قورئان شەیتان ناڕەحەت و خەمبار دەكات و دەیهێنێتە

گریان، ئەمەش لەبەر ئـەوەی كـە مـەكرو فێڵەكـەی ناتوانێـت ئـارەزووی نوێژ خوێن لەسەر یادو زیكری خوا لاواز بكات.

لــە ئــەبو هــورەیرەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) پێغەمبــەر (ﷺ) دەفەرمێت:

﴿إذا قرأ ابن آدم السجدة فسـجـد، أعتـزل الشيـطـان يبـكي، يقول: يا ويـلـي، أمـر ابن آدم بـالسجـود فسجد فلـه الجـنة، وأمـرت بـالـسجود فأبيت فلـي الـنـار﴾.

واتە: كاتێك مـرۆڤ قورئـان دەخوێنێـت و دەگاتـە كڕنووشـی قورئـان خوێنـدن و كڕنـووش دەبـات، شـەیتان خـەمگین و ناڕەحـەت دەبێـت و دەڵێت : وە یل بۆ من فەرمان بەمرۆڤ كرا بۆ كڕنووش بردن ، كڕنووشـی بـردو بەهەشت بۆ ئەوە، فــەرمانیش بــە مـن كـرا بـۆ كڕنــووش بــردن، كڕنووشم نـەبرد، كەواتە ئاگـر بۆ منە.

## ١٤) پەناگرتن بەخوای گەورە لەشەیتان:

بێ گومان شەیتان دوژمنـی سـەرەكی ئێمـەی موسڵمانە وەك خـوای گەورە دەفـەرمێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ (فاطر: ٦).

واتە:بێ گومانِ شـەیتان نەیارتانـە، دەسـا ئێـوەیش ئـەو بـەدوژمن و نـەیار بـزانن و ڕەفتارەكـانی ئـەو وەلا بنێن،چـونكە بەڕاسـتی شـەیتان

گرووپ و شوێن کەوتوانی خۆی بانگ دەکات بۆئەوەی پێکەوە ببنە یارو هاوەڵی ئاگری دۆزەخی هەڵگیرساوی بلێسەدار.

لەدژایەتیەکانیشی بۆ ئێمەی موسڵمان هەستانیەتی بەدروست کردنی دوو دڵی و گومان لەدڵی نوێژ خوێندا لەکاتی ئەنجام دانی نوێژدا، بەمەش ملکەچی لەدڵی نوێژ خوێندا نامێنێت و نوێژ خوێن لەنوێژەکە دادەبڕێت.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دوو دڵی و گومان و بیرکردنەوە لەنوێژدا ڕێگرە، لەهەموو نزیك بوونەوەیەك و بەرەو خوا چوونێك! چونکە نوێژ خوێن لەناخەوە هیچ ئاگاداری ئەو نزاو پاڕانەوەو قورئان خوێندنەی ناو نوێژەکەی نیە، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر نوێژ خوێن کە دامەزراو بێت و دان بەخۆیدا بگرێت و هەوڵ بدات لەکرۆکی نوێژەکەی بەئاگا بێت ؟ چونکە بەئاگا بونی ئێمە لەنوێژەکانمان دەبێتە هۆی پوچەڵ کردنەوەی مەکروفێڵەکانی شەیتان:﴿...إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ (النساء: ٧٦).

واتە:بێ گومان پیلان و فرِوفێڵی شەیتان لەچاو دەستەلآت و توانای خوای گەورەدا لاوازوبێ هێزە.

لەکاتێکدا بەندە دەیەوێت بەدڵێکی پاکەوە ڕوو بکاتە خوای گەورە، بەلآم شەیتان لەچەند لای ترەوە بەخەیاڵ و بیرکردنەوە لەکێشەو گیرو گرفتە دونیاییەکان بەندەکە سەرقاڵ دەکات ، ئا لەو

ساتەدا شەیتان هەموو هەوڵێكی نەزۆكانەی خۆی دەخاتە گەڕ هەتا ببێتە بەربەستی نێوان پەروەردگارو بەندەكەی! كاتێك بەندە دەیەوێت بەرەو لای سۆزو میهری پەروەردگاری بڕوات، شەیتان لەو نێوەندەدا هەوڵ دەدات ببێتە ڕێگرو نایەڵێت ئەو كەسە بە دیداری خۆشەویستەكەی بگات و،بەبەردەوامی هەوڵی وەستاندنی ئەوگەشتە ڕۆحیەی موسڵمان دەدات كەدەیەوێت لەنوێژەكەیدا بە خزمەتی خوای گەورە بگات.

لەبەر ئەوە هەندێك لەپێشینانیش دەڵێن: گاورو جولەكەكان دەڵێن ئێمە دوو دڵ نین، پێشینانیش دەڵێن ڕاست دەكەن، شەیتان چی لەماڵێكی وێران بكات.

بانمونەیەكی جوان لەو بارەوە بهێنینەوە:

سێ ماڵمان هەیە: ماڵی پاشایەك كە شتی زۆر بەنرخ وگرانبەهاو نایابی تێدابێت ، وەماڵی بەندەیەك شتی زۆر بەنرخ وگرانبەهاو نایابی بەندەكەی تێدابێت،بەلاَم وەك ئەوەی پادشاكە نەبێت،ماڵێكیش خاڵی بێت و هیچی تێدا نەبێت، پرسیارەكە لێرەدایە: ئەگەر دزێك بێت بۆ دزی كردن لەیەكێك لەو سێ ماڵانەدا، ئایا دزەكە ڕوو لە كام ماڵیان دەكات بۆ دزی كردن!؟

بەندە كاتێك دەوەستێت بۆ نوێژ شەیتان لێی ڕادەكات، چونكە دەزانێت كە ئەو بەندەیە لە گەورەترین شوێندا وەستاوەو زۆریش نزیكە

لەخواوەو بۆ جێ بەجێ كردنی داوایەكی خوای گەورە وەستاوە لەبەر ئەمەیە كەشەیتان ڕادەكات، چونكە لەوە گەیشتووە كە نوێژ خوێنەكە بڕیاری داوە زیاتر لەدژی شەیتان بجەنگێت و بەگوێی نەكات، لە بەرئەوە بەردەوام شەیتان لە سەنگەردایە تا بەهەر شێوازێك بووە نوێژ خوێن لەنوێژەكەی سارد بكاتەوەو هەوڵ بدات لەنوێژ دووری بخاتەوە، بەهەر شێوازێك بۆی بلوێت هەوڵ دەدات نوێژ بەسادەو ساكاری بهێنێتە پێش چاوی نوێژ خوێنەكە، بەڵام كەبۆی دەركەوت نوێژ خوێنەكە لەوانە نیە كەبتوانێت فریوی بدات،ئیدی شەیتان دڵگران دەبێت و هەر لەنزیكیەوە دەمێنێتەوەو هەوڵ دەدات دوو دڵی بۆ دروست بكات و ناكۆكی بخاتە نێوان نوێژ خوێن و دڵیەوە لەنوێژەكەیدا، لەبەر ئەوە بەردەوام لەهەوڵدایە ئەو شتانەی وەبیر بخاتەوە كەپێش نوێژەكەی لەبیریدا نەبووە، بەو شێوازە پێویستیەكی گرنگی بیر دەخاتەوەو سەرئەنجام بێ ئاگای دەكات لەنوێژەكەی، بەمەش بەندەكە دڵی لەلای نوێژەكەی نامێنێت و بێ ئاگا دەبێت لەخوای گەورەو بەشێوەیەك نوێژەكەی ئەنجام دەدات كە دڵ و دەروونی ئامادەی ئەو گفتوگۆ گرنگە نیە، كە لەگەڵ خوادا ئەنجامی دەدات، بەو شێوەیە لەڕوانگەی وەرینی تاوانەوە، وەك پێش ئەنجام دانی نوێژەكە دەمێنێتەوەو هیچ تاوانێكی لێ ناوەرێت بەئەنجام دانی نوێژەكە !لەبەر ئەوە نوێژەكەی ئەوەندە بەرێك و پێكی ئەنجام نەداوە هەتا ببێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەكانی

پێشووی؟! چونکە ئەگەر نوێژ بەرێك و پێکی و بەو شێوەیەی کە خوای گەورەو پێغەمبەر (ﷺ) داوامان لێ دەکەن ئەنجامی بدەین ئەوا دەبێتە مایەی سڕینەوەی تاوانەکانمان، جگە لەتاوانە گەورەکان کە ئەمان تەوبەی تایبەتی و یەکجارییان پێویستە.

بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فێڵی شەیتان پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) ڕێنماییمان دەکات بەکۆمەڵێك چارەسەر لەوانە: ئەبی عاص(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەیتان دێتە نێوان من و نوێژەکەمەوەو خوێندنەوەکەم لێ تێك دەدات..؟!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ﴿ذاك شيطان يقال له خنزب، اذا أحْسَستَه فتعوّذ بالله منه واتفُل على يسارك ثلاثا﴾.

واتە: ئەوە شەیتانێکە ناوی (خەنزەب) ە کاتێك هەستت پێی کرد، پەنا بگرە بە خوای گەورە لێی و سێ جار تف بکە بەلای چەپدا،ئەبی عاص دەفەرمێت: وام کردو خوای گەورە لەو شەڕ و خراپەیەی شەیتان ڕزگاری کردم.

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفێڵێکی تری شەیتان و چارەسەرەکەشی ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرمێت: ﴿إنّ أحدكم إذا قام يصلي جاء الشّيطان فلبس عليه﴾يعني خلط عليه صلاتَه وشكّكه فيهاحتّى لايدري كم صلّى﴿،فإذا وجد ذلك أحدكم فَلْيسجد سَجدتين وهو جالس﴾.

واتە: کاتێك یەکێك لەئێوە نوێژ دەکات، شەیتان دێت و سەری لێ تێك دەدات و نازانێت چەند ڕکاتی کردووەو گومانی بۆ دروست دەکات، ئەگەر یەکێك لەئێوە وای لێ هات با دووجار کڕنووش ببات لەکاتێکدا ئەگەر دانیشتبێت.

هەمان کات پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) لە فێڵێکی تری شەیتان ئاگادارمان دەکاتەوەودەفەرمێت:﴿إذاكان أحدكم في الصلاة فوجد حركة في دبره أحدث أو لم يحدث،فأشكل عليه، فلا ينرف حتّى يسمع صوتاً أو يجد ريحاً﴾.

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەنوێژدا بوو، وە هەستی بەجوڵەیەك کرد لەکۆمیداو گومانی لادروست بوو، کە ئایا دەست نوێژی شکاوە یان نا؟یاخود لەو بارەوە سەری لێ شێوا،ئەوا با دەست لەنوێژەکەی هەڵنەگرێت هەتا دەنگێ دەبیستێت یان بۆنێك دەکات.

**پرسیار:**

فێڵێکی تری شەیتان ئەوەیە کە (خەنزەب) پێی هەڵدەستێت بەرانبەر بەهەندێك کەسی چاکەکارو خێرخواز، بەوەی لەناو نوێژەکەدا خەریکیان دەکات بەبیر کردنەوە لەهەندێ کارو پڕۆژی خەیری، بۆ نمونە سەرقاڵ کردنیان بەهەندێك کاروباری وەك بانگەوازو یارمەتی دانی مندالأنی بێ باوك و دایك و خەڵکی هەژار و لێ قەوماو....هتد. بەو شێوەیە نوێژ خوێنەکە دەخاتە ناو دەریای بیرکردنەوەو بێ ئاگاییەوە، بەبێ ئەوەی ئاگای لای بەشەکانی جوڵەی نوێژەکەی بمێنێت، ئەگەر

لێیـان بپرسـیت؟ بـرام ئـەو بیركردنەوانـەش لـەناو نوێـژدا ناشـەرعی و یاساغن!لەوەلآمدابەرگری لەخۆ دەكەن و دەڵێن: ئیمـامی عومـەر لـەناو نوێژدا نەخشەی داناوەو سوپاشی ئامادەكردووە.؟!

ئیبنـو تەیمیـە(خـوای لێ ڕازی بێـت) زۆر بـەجوانی ئـەم بابەتـە ڕوون دەكاتـەوەو دەفـەرمێت: ئـەوەی كـە لـە عـومەری كـوڕی خەتتابـەوە گێرردراوەتـەوەو دەفـەرمێت: مـن سـوپایەكم ئامـادە كـردووەو لـەناو نوێژیـشدا بـووم؟ لەبـەر ئەوەیـە كـە ئیمـامی عومـەر پێـشەواو ئـەمیری موسـڵمانان بـووە، ئـەركێكی گـەورەی خـوایی لەسـەر شـان بـووە، كـە ئەمیری جەنگ و جیهاد بووە، چـونكە ئـەم بیركردنەوەیـە لەوانەیـە بـۆ كەسێك گونجـاو بێـت كـە نوێـژی تـرس (الـصلاة الخـوف) ئـەنجام بـدات لـەكاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دوژمندا،هـەر بۆیـە دەگونجێـت بـەهۆی ترسناكی و ناڕەحەتی دۆخەكەوە لەنوێژەكەی بێ ئاگا بێت.

( لەوانەشە ئەو بیر كردنەوەیەی ئیمام عومەر لە ناو نوێژی سوننەتدا بوو بێت)،گومانیشی تێدانیە كە ئـارامی دڵ و دەروون لـەكاتی جـەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا هەرگیز وەك ئارامی وحاڵەتی ئاشتی و هێمنی نیـە، لەبەر ئـەوە ئەگـەر لـەكاتی جەنگدا هەسـتی بەكەمتەرخەمییـەكی كـەم كردبێت لەنوێژەكەیدا، ئەوە لەبەرژەوەندی گشتی موسڵمانان دا بـووە، بـێ گومـان ئەمـە كاریگـەری نابێـت لەسـەر ئیمـان و گوێڕایـەڵی مرۆڤـی باوەڕدار بۆ خوای گەورە، هەر لە بەر ئەمەشە كەنوێژی ترس بە بەراورد

لەگەڵ نوێژی کاتی ئاسایش و هێمنایەتی ولاتدا گەلێك ئاسانکاری تێدا کراوە.وەك خوای گەورەدەفەرمێت﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾﴾ (النساء: ١٠٣)، واتە: کاتێك دڵنیا دەبن و ترستان نامێنێت ئیتر بەئاسایی ، وەکو جاران نوێژەکانتان ئەنجام بدەن، بەڕاستی نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزێکەو کات و شێوەی ئەنجام دانەکەی لەلای خوای گەورە دیاری کراوە، ئەگەر حاڵەتێکی نائاسایی پەیدا نەبوو نابێت لێی لابدرێت.

لەم ڕوانگەیەوە پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین کە بەندەکانی خوای گەورە لەچۆنیەتی ئەنجام دانی نوێژدا جیاوازییان هەیە، ناکرێت ئێمەیەك لەم سەردەمەدا وەها بیر بکەینەوە چونکە ئێمە لەگەڵ پلەو پایەو ئیمان و بەرپرسیاریەتی ئیمام عومەردا زۆر جیاوازین، ئەو عومەرەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دەفەرمێت: (عومەر بەهەر کۆڵانێکدا بڕوات شەیتان ناوێرێت لەوێوە بڕوات لەترسی ئیمامی عومەر)، ئەو عومەرەی کەخوای گەورە ئەوی کردە هۆکارێکی بەهێز کردنی ئاینی ئیسلام! بالەوەش دڵنیا بین کە نوێژی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لەکاتی ئاشتی و هێمنیدا ڕێك و پێك تر بووە لەنوێژی کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن.

لەبەر ئەوە براو خوشکانی موسڵمانم، ئەو گوفتارو ڕەفتارەی ئیمامی عومەر نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ئێمەش بەو بیانووەوە لەنوێژەکانمان بێ

ئاگا بین، با تەنها نوێژ كردنمان بۆ خۆ ڕزگار كردن نەبێت لەنوێژەكە، بەڵكو با نوێژ بۆ ئەوە ئەنجام بدەین كەبە هۆیەوە ڕزگار بین لەسزاو ئازاری بەرزەخ و دۆزەخ.

چونكە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئیمامی عومەر ئەمیر بووەو بەرپرسیاریەتێكی گەورەی خوایی لەسەر شان بووە، بۆیە جاری وا هەبوو دەگریاو دەیوت لەوە دەترسم ئەگەر بەو شاخەوە گوێ درێژێك بەربێتەوە خوای گەورە لەو دنیا لێپرسینەوەم لەگەڵدا بكات، چونكە لەسەر من پێویستە ڕێگاكەی بۆ چاك بكەم.؟! بەڵێ ئیمامی عومەر هەموو مێژوو لەسەری شاهیدە كەتا درەنگانێكی شەو بەشەقامە كانی مەدینەدا دەگەڕا، هەتا لەكێشەی خەڵك ئاگادار بێت و خزمەتی بێوەژن و هەتیوو هەژارانی دەكرد، تەنانەت شەوانیش بەكۆڵی خۆی خواردنی بردووە بۆ هەتیوان و هەرخۆیشی ئاگری دەكردەوەو خواردنەكەی بۆ ئامادە دەكردن و دوكەڵەكەش دەچوو بەسەرو ڕیشی پیرۆزیدا..؟!

بەڵێ برایانی خۆم باچاك بزانین شەیتان كۆمەڵە شتێكی بێ بایەخ لەژیانی كەسی نوێژ خوێندا وە بیر نوێژ خوێنەكە دەخاتەوە، كە ئەسڵەن پێش نوێژەكە ئەم بابەتانە جێی بایەخی ئەم كەسە نەبوون و ڕەنگە بەخەیاڵیشیدا نەهاتبن، ئەمەش نەخشەو فێڵی شەیتانە كە بۆ نوێژ خوێنەكەی دادەنێت.

هەندێك لەپێشینان دەگێڕنەوە كە: پیاوێك سامانێكی خۆی لەشوێنێكدا شاردبووەوە شوێنەكەی بزر كردبوو هەستا دەستی كرد بەنوێژ كردن، پاش كەمێك شوێنی سامانەكەی بیركەوتەوە ،پرسیاری لێ كرا سەبارەت بە چۆنیەتی بیركەوتنەوەی شوێنی سامانەكەی ؟ ئەویش لە وەڵام دا وتی: بۆم دەركەوت شەیتان لەنوێژدا واز ناهێنێت لەو كەسەی نوێژ دەكات تائەو شتەی بیر نەخاتەوە كەپێشتر پێوەی سەرقاڵ بووە، ئەمەش لەبەر دڵسۆزی شەیتان نیە بۆ ئەو كەسە، بەڵكو بۆ ئەوەی كەمترین نوێژ بكات و كەمترین پاداشتی بۆ هەبێت.

**١٥) ڕامان و وردبوونەوە لەشێوازی نوێژكردنی پێشینان:**

ئەمەش ملكەچی زیاتر دەكات و یارمەتی دەری نوێژ خوێنە كەپێیانەوە پەیوەست ببێت و بەشوێن ڕێچكەو ڕێبازی پێشینە چاكەكانماندا هەنگاو هەڵبگرێت ؟ چونكە پێشینان لەگەڵ چوونە ناو نوێژ دەست بەجێ ڕەنگ و ڕوخساریان لە ترسی پەروەردگار گۆڕانی بەسەردا دەهات؟ ئەمەش لەبەر ئەوە بوو كە ئەوان بەتەواوەتی دەركیان بەو ڕاستیە كردبوو كەنوێژ بریتیە لەگفتوگۆ كردن لەگەڵ زاتی پیرۆزی (الله)دا، هەر لەبەر ئەمە بوو كاتێك دەچوونە ناو نوێژ دڵ و هۆشیان تێك دەچو و بەترس و شەرمەوە بەرانبەر پەروەردگاریان دەوەستان.

موجاهید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: ئەگەر کەسێك هەستابایە بەئەنجام دانی نوێژێك، لەخوا دەترسا کەچاو لەیەك شت ببڕێت لەنوێژەکەیدا، یان ئاوڕ بداتەوە یاخود بەرد هەڵبگرێتەوە "ئەو کاتە مزگەوت لەجیاتی فەرش و ڕایەخ بەردو چەوی تێدابووە" یان گاڵتە بەشتێك بکات یان خۆی خەریك بکات بەشتێکەوە، یان لەگەڵ خۆیدا سەبارەت بە کاروباری دونیایی بدوێت، کە ئەمانە هەموو دەبنە هۆی لەبیر چوونەوەی نوێژەکە.

جارێکیان موسلیمەی کوڕی بەششار (خوای لێ ڕازی بێت) لە مزگەوتدا نوێژی دەکرد،بەشێکی مزگەوتەکە ڕووخا، هەموو نوێژ خوێنەکان مزگەوتەکەیان بەجێ هێشت، بەڵام ئەو لە نوێژدا بوو هەستی بە ڕووخانی مزگەوتەکە نەکردبوو و لە نوێژەکەی بەردەوام بوو،ئەو هاوەڵە بەڕێزە ئەوەندە بەخشوعەوە نوێژەکەی ئەنجام داوەو سەرەنجام ئاگای لەوە نەبووە کە مزگەوتەکە ڕووخاوەو نەیزانیوە لە دەوروپشتیدا چی دەگوزەرێت ! !

بەڵێ پێشینان بەو شێوازە نوێژیان ئەنجام دەدا،لەبەر ئەوە گرنگترین دەسکەوت بەلای ئەوانەوە چاك ئەنجام دانی نوێژەکەیان بوو،هەندێك لەنوێژدا دەچەمانەوەو لوول دەبوون و ڕەنگیان دەگۆڕا لەبەردەم خوای گەورەدا، وە هەندێکی تریان لەگەڵ دەست نوێژگرتندا ڕەنگیان دەگۆڕا لەترسی خوای گەورە، ئەگەر بەیەکێکیان بوترایە

بۆچی ڕەنگت تێك دەچێت لەگەڵ دەست نوێژگرتندا؟ لە وەڵامدا دەیوت: لەبەر ئەوە دەزانم ئێستا لەبەردەم کێدا ڕادەوەستم.؟!

ئەوە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیبە (خوای لێ ڕازی بێت)، کاتێك خۆی ئامادە دەکرد بۆ نوێژ، شێوەو ڕووخساری دەگۆڕاو لەرزی لێ دەهات! کە پێیان دەوت ئەوە چیتە؟ دە یفە رموو سوێند بەخوا ئێستا کاتی ئەنجام دانی ئەمانەتێکە کەخوای گەورە دای بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکاندا وەریان نەگرت و خەریك بوو هەپروون هەپروون دەبوون و ئێمەی مرۆڤ بەو لاوازییەمانەوە وەرمان گرت. !

سەعیدی تەنوخی (خوای لێ ڕازی بێت)کاتێك دەچووە ناو نوێژەوە بە بەردەوامی حاڵی هەر گریان بوو، بەفرمێسکەکانی ریشی تەڕ دەبوو،ئایا کێ لەئێمە تائێستا بەو ڕۆحیەتەوە نوێژی کردووە؟ ئەمە پرسیارێکەو با هەموومان لای خۆمانەوە وەڵامی بدەینەوە.

بەعامری کوڕی عەبدولقەیسیان وت: ئایا لەنوێژدا لەگەڵ نەفسی خۆت دەدوێیت؟ ئەویش لە وەڵام دا وتی:ئایا شتێك هەیە لەلام لە نوێژ خۆشەویست تر بێت؟

وتیان:ئێمەلەنوێژەکانماندا لەگەڵ خۆمان دەدوێین،فەرمووی: باسی بەهەشت ودۆزەخ وقیامەت..هتد، دەکەن وتیان: نەخێر، سەبارەت بەکەس و کارو سەروەت و سامانمان دەدوێین، ئەویش فەرمووی:هەتاکوزیاترپیرببم نوێژ لەلام خۆشەویست تر دەبێت!

سەعدی کوڕی موعاز (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت:سێ تایبەتمەندی هەن لەمندا لەحاڵەتەکانی تردا بەدی دەکرێن:ئەگەر لەنوێژدا بم بێجگە لەوەی کەتیایدام هیچ لەگەڵ خۆمدا ناڵێم،ئەگەر گوێم لەفەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) بێت گومان لەدڵمدا نیە کە ئەوە ڕاستە، ئەگەر لەگەڵ جەنازەیەکدا بم هیچ لەگەڵ خۆمدا ناڵێم بێجگە لەوەی دەیڵێم و پێی دەوترێت.

حاتەم (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: هەڵدەستم بە ئەرکی خۆم بۆ نوێژ کردن، بەترسەوە دەڕۆم بەنیەتەوە دەست پێدەکەم، بەگەورەیی نواندن تەکبیری نوێژ دابەستن دەکەم، بە تەرتیل و بیرکردنەوەوە قورئان دەخوێنم، بەترسەوە دەچەمێمەوە، بە ملکەچیەوە کڕنووش دەبەم،بۆ شایەتی دان لەنوێژدا بە تەواوی دادەنیشم، بەنیەتەوە سەلام دەدەمەوە، وە بەدڵسۆزیەوە بۆ خوای بەرزو بالآ نوێژەکە تەواو دەکەم و، بەترسەوە دەگەڕێمەوەو لەوە دەترسم نوێژەکەم لەلایەن خواوە وەرنەگیرابێت، وە من پارێزگاری لە نوێژەکانم دەکەم هەتا مردن.

هەروەهائەبوبەکری سەبغی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: هەستم کرد کە دوو ئیمامی نوێژ هەن باشترین ئیمامێکن کە گوێم لێ گرتبن ئەوانیش (ئەبو حاتەمی ڕازی و موحەمەدی کوڕی ناسر) بوون، ئیبن ناسر باشترین نوێژی دەکرد کەسم نەدیوە وەك ئەو نوێژ بکات،

جارێکیان زەردەواڵەیەك "مێروویەك" دای بە تەوێڵیەوە خوێنی لەدەم و چاوی هێنا بەهیچ جۆرێك نەجولاَیەوە.

محمدی کوڕی یەعقوبی ئەخرەم (خـوای لیَ ڕازی بێـت)دەفـەرمێت: کەسم نەدیوە لە محمدی کوڕی ناسر باشتر نوێژ بکات، لەکاتێکدا نوێژی دەکرد مێشێك بە گوێیەوە نیشتبووەوە دەری نـەکرد، وە ئێمە سەرمان لەخشوع و ڕێك و پێکی نوێژەکەی سـوڕدەما، چـەناگەی لەسـەر سـنگی دادەنـا وەکـو دارێکـی وشـك دەوەسـتا لەخزمـەتی پـەروەردگاردا بەشەرمەوە نوێژی دەکرد .

موجاهیـد (خـوای لیَ ڕازی بێـت) شـێوازی نوێـژ کردنـی ئـیبن زوبێـر دەگێڕێتەوە و دەفەرمێت: هیچ کەسێکم نـەدیتووە لـە عەبـدوڵای کـوڕی زوبێر چاکتر نوێژی ئەنجام دابێت !

لەکاتی کڕنـووش بردنـدا وەك دارێکـی وشـك هـەموو جەسـتەی لـە جووڵە دەکەوت، لەوەش سەیرتر ئەوەیە هەنـدێك جـار ئەوەنـدە بـە بـێ جووڵە لـە کڕنوشـدا دەمایـەوە باڵنـدە لـە سـەر پـشتی دەنیشتنەوە وا هەستیان دەکرد ئەوە دارێکە نەك مرۆڤ ، هێندە بـە ملکەچـیەوە نوێـژە کانی ئەنجام دەدا.؟!

شەیخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە (خوای لیَ ڕازی بێت) کاتێـك دەسـتی دەکرد بەنوێژ هـە مـوو جەسـتەی دەهاتـە لـەرزە، هـەتا لـەلای چـەپ و ڕاستەوە نوێژ خوێنەکانی دەورو پشتی لێی بێزار دەبوون.؟!

دەی با هەریەك لەلای خۆمانەوە بەراوردی نوێژكردنی ئەم پیاوە بكەین لەگەڵ شێوازی نوێژكردنی ئەم سەردەمەی خۆماندا !

یەكێك سەیری كاتژمێر دەكات، ئەوی دی خەریكی خۆ جوان كردن و قژ داهێنانە، هەندێكی تر خەریكی كڕین و فرۆشتنن لەناو نوێژەكانیاندا، یەكێكی دی خەریكی ئەژماری سەروەت و سامانەكەیەتی، ئەوی تر بۆ زوخرف و جوانی فەرش و دیوارو سەقفی مزگەوتەكە دەڕوانێت، برایەكی تریش هەوڵ دەدات بەچاو لار كردنەوە بۆی دەربكەوێت ئەوەی تەنیشتی كێیە نوێژ دەكات! ! ؟ بێ گومان ئەم هەموو بیركردنەوەو خەیاڵاتانە لەنوێژەكانی هەندێكماندا بوونیان هەیە،لەڕاستیدا شەیتان لەم بوارەدا ئەوەندە چاك ئەسپی خۆی تاوداوە، هەندێكمان كە دەچینە ناو نوێژ وا ڕاهاتووین چی كێشەو گیروگرفت و نەگبەتی و قوڕ بەسەری دونیایە هەمووی لەناو نوێژدا دەخەینە ڕوو، وەك ئەوەی جگە لەم دە خولەكەی كاتی ئەنجام دانی نوێژەكە كاتی ترمان بە دەستەوە نەبێت بۆ بیركردنەوە لەچارەسەری گرفتەكان، ئەمەش وا دەكات كە دەروونی مرۆڤ دوچاری شوك و ناڕەحەتی ببێت و ئاگای لەلای نوێژو بەندایەتیەكەی نەمێنێت.

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا كەنوێژ واتە گفتوگۆ كردن لەگەڵ درووستكەری ئاسمانەكان و زەویدا، ئایا ئەگەر لەبەردەم سەرۆكێكی دونیادا ڕامان بگرن دەتوانین ئەو هەڵسووكەوتانە بكەین! ؟ بێگومان نەخێر.

## ١٦) زانینی چێژو سودی ملكەچی لەنوێژدا:

لەم بارەوە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿مامن امرىء مسلم تحضره صلاة مكتوبة فيحسن وضوءها وخشوعها وركوعها، إلا كانت كفّارة لما قبلها من الذنوب مالم تؤت كبيرة، وذلك الدّهركله﴾.

واتە: هەر موسڵمانێك بەئامادەییەكی تەواوە بۆ نوێژێكی فەرز خۆی ئامادە كرد، پاشان دەست نوێژی بەجوانی شۆردو چەمینەوەو كڕنووشی تەواوبوو و ملكەچی نواند لەنوێژەكەیدا، ئەوا خوای گەورە ئەو نوێژە دەكاتە كەفارەتی تاوانەكانی، مادام تاوانی گەورەی نەبێت ئەوەش بۆ هەموو ساڵەكەیە بە بەردەوامی.؟!

بیرمان نەچێت پاداشتی نوێژیش پەیوەستە بە ئاستی ملكەچی نواندن بۆ خوای گەورە لەنوێژەكەدا وەك پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) دەفەرمێت:

﴿إنّ العبد ليصلي الصّلاة ما يكتب له منها إلا عشرها، تسعها، ثمنها، سبعها، سدسها، خمسها، ربعها، ثلثها، نصفها﴾..

واتە: بەڕاستی بەندە نوێژێ لەنوێژان دەكات جاری واهەیەهیچی بۆنانوسرێت لەخێری نوێژەكەی ئیللا دە یەكی بۆ دەنووسرێت، یان نۆیەك، هەشت یەك، حەوت یەك، شەش یەك، پێنج یەك، چواریەك، سێ یەك، هی واهەیەنیوەی نوێژەكەی بەچاكە بۆ دەنووسرێت.

هەروەك مرۆڤی باوەڕدار لەتاوان و گوناهیش پاك دەبێتەوە لەكاتێكدا كە بەندە بە ڕكوع و كڕنووشێكی تەواوەوە نوێژەكە ئەنجام بدات،هەر لەم بارەوە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿إن العبد إذا قام يصلي أتى بذنوبه كلها فوضعت على رأسه وعاتقيه، فكلما ركع أو سجد تساقطَتْ عنه﴾.

واتە: كاتێك موسڵمان هەڵدەستێت بەئەنجام دانی نوێژ هەموو تاوانەكانی لەسەر سەری دادەنرێن، لەگەڵ هەر ڕكوع و كڕنووش بردنێكدا گوناهی لێ دەوەرێت.

مەنناوی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: مەبەست لەوەیە لەگەڵ چاكی و تەواوی هەر بەشێكی نوێژەكەیدا بەشێكی گوناهەكانی لێ دەوەرێت، ئەگەر هەموو نوێژەكەی بەڕێك و پێكی ئەنجامدا، ئەوا هەموو گوناهەكانی لێ دەوەرێت.

ئەمە بۆ نوێژێكە كە مەرجەكان و پایەو ملكەچی زۆری تێدا بەرجەستە ببێت، هەر لەبەر ئەمەشە وشەی (بەندە، هەستان) بەكارهاتووە، كە ئاماژەیە بۆ ئەوەی بەندەكە بەشێوەیەكی لاوازو بێ هێزو بێ توانا لەبەردەم پاشای جیهانیان وەستاوە.

ئەگەر نوێژ ملكەچی و خشوعی بۆ خوای گەورە تێدابوو، ئەوا نوێژخوێن هەست بەئارامیەكی لە ڕادەبەدەری دەروونی و جەستەیی دەكات، ووزەیەكی زۆری دەروونی و جەستەیی بۆ دروست دەبێت، تا

دەگاتـە ئـەو ئاسـتەی کـە حـەز ناکـات لەنوێژەکـەی داببڕێـت! چـونکە نوێژەکە بووەتە مایەی ڕووناکی دڵ و دەروونـی و بـەردەوام شـادی پـێ دەبەخشێت، بەم شێوازە ملکەچی نواندن لەنوێـژدا هـەم یارمـەتی دەرە بۆمان تا بەسـەر کێـشەوگیروگرفتەکانی دونیامانـدا سـەرکەوین، هـەمان کـات ئـارامیش بـەژیانی ڕۆژانـەمان دەدات ، لـەوەش خۆشـتر ئەوەیـە کەلەڕۆژی دوایی دا ڕوو سووری بەردەم بارەگای خوامان دەکات، ئەگەر کەسـێك لەوانـەی بـەم شـێوازە لەنوێـژ گەیـشتووە بـدوێنیت، هەسـت دەکەیت بابای نوێژ خـوێن لەگـەڵ سـەلام دانـەوەو خـوا حـافیزی کـردن لەنوێژەکە وا گومان دەبات کە لەزیندانداییەو دڵی ئاسوودە نابێت تاکاتـی ئـەنجام دانـی نوێـژێکی فـەرزی تـر دێـت؟ چـونکەئەم کەسـانە لـەواتاو نـاوەڕۆك و تـام و چـێژی نوێـژ گەیـشتوون وبەئـەنجام دانیـشی ئـارامی بۆدەروونیان دەگەڕێتەوە.

بەڵام بەداخەوە نوێژکردنی هەندێکمان پێچەوانەیەو زیاتر لـەوەرزش و خوویەك دەچێت، هەر بۆیە نوێژەکە خۆزگە دەخوازێت کەزوو ڕزگـاری ببێـت لـەو جـۆرە کەسـانەی کـە بـەم شـێوازە نوێـژ دەکـەن و لـەکۆڵی خۆیانی دەکەنـەوە، چـونکە ئـەو کەسـانە هـیچ شـتێك لـە بـارەی مانـاو ناوەڕۆکی نوێژ نازانن.

لەبەر ئەوە تامەزرۆیانی نوێژ دەڵێن: ئێمـە نوێـژ دەکـەین تـا لـەناو نوێژەکەدا بحەوێینەوەو ئاسودە ببین.

هەروەك سەرداری مرۆڤایەتیش (ﷺ)دەفەرمێت: ﴿یا بلال أرحنا با الصلاة﴾ واتە: ئەی بیلال بەنوێژ بمان حەوێنەرەوە وئاسوودەمان بكە.

یان دەیفەرموو: ﴿وجُعلتْ قرّة عيني في الصلاة﴾.

واتە: ڕووناكی چاوانم لەنوێژدایە.

ئەگەر كەسێك ڕووناكی چاوی لە نوێژدا بێت، ئیدی چۆن بە دووركەوتنەوەی لە نوێژ چاوەكانی ئارام دەگرن..؟!

## ١٧) هەوڵدان بۆ نزاكردن لەنوێژدا بەتایبەت لەكڕنووش بردندا:

گومانی تێدا نیە كە خۆ بەلاوازو كەم سەیركردن لە بەردەم خواداو گەڕاندنەوەی نزاو داواكارییەكانمان بۆ بەردەم بارەگای ئەو، زیاتر هانی مرۆڤی موسڵمان دەدات كە پەیوەست ببێت بە خوای خۆیەوەو ، زیاتر ملكەچی و هەژاری خۆی بنوێنێت لە بەردەم پەروەردگاردا،خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾.

واتە: بە لارە ملی و ترسەوەو بەنهێنی و لەسەرخۆ، هەمیشە بەگەورەیی یادی خوای پەروەردگارت بكە، هەموو بەرە بەیان و دەماو دەمی ئێوارانێك هەرگیز لە بێ ئاگایان مەبە، واتە لەوانە مەبە كە پەند وەرناگرن لەنزاكردندا.

ئـەبوو موسـای ئەشـعەری(خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمێت: لـە سەفەرێکدا هەندێك لە خەڵکەکە لەنزاکردندا دەنگیـان بـەرز دەکـردەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) گوێی لێ بوو خەڵکەکە بەدەنگی بەرز دوعا دەکەن فەرمووی: بەهێواش و لەسەرخۆ دوعا بکـەن، چـونکە ئێـوە لەکەسێکی کەڕوو دوور داوا ناکەن، بێ گومان پەروەردگاری ئێوە نزیك و ببیسەرە.

هەروەها پێغەمبەری خـوایش (ﷺ) سـەبارەت بـەدوعا دەفـەرمێت: ﴿الـدعاء مخ العبادة﴾. واتـە: نزاو پاڕانـەوە کرۆکـی عیبادەتـە.هـەروەها دەفەرمێت: ﴿مـن لـم یـسأل الله یغـضب علیـه﴾ واتـە: هەرکەسێك داوا لەخوا نـەکات خوای گەورەلێی تووڕە دەبێت. هەروەهالـە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿الدعاء أکبـر العبادة﴾.

واتە: نزاو پاڕانەوە گەورەترین بەندایەتی و پەرستشە؟

چـونکە نـزاو پاڕانـەوەو داواکـردن سـەلمێنەری ئـەو ڕاسـتیەن کـەتۆ دەڵێیت خوایە گیان جگە لەتۆ داوای هیچ شتێك لەکـەس ناکـەم و تـەنها موحتـاجم بـەهاوکاری و یارمـەتی دانـی تـۆ، بیرمـان نەچـێت ئێمـەی موسڵمان ڕۆژانە زیاد لە حەڤدە جار بەڵێن بـە خـوا دەدەیـن و دەڵـێین: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ لێرەدا پێویستە ڕای بگەیەنین یەکێك لـە مەرجـەکان ئەوەیـە کەپێویـستە مرۆڤـی بـاوەڕدار بـە داواکارییـەکانی بیـسەلمێنێت کـە ئـەو بەنـدەی خوایـەو پێویـستی بـەهاوکاری خـوای پەروەردگارە.

جارێکیان پیاوێك لەتەنیشت عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکەوە (خوای لێ ڕازی بێت)نوێژی دەکرد، پاش سەلام دانەوە، ویستی بچێتە دەرەوە، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکیش دەستی گرت و پێی فەرموو: دانیشەو دوعا بکە، مەگەر موحتاجی یارمەتی خوای گەورە نیت؟! وە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە کە لەچەند جێگەیەکی نوێژدا نزای کردووە وەك لەکاتی کڕنووش بردن و نێوان دوو کڕنووشەکەو لەکۆتایی (تەحییات) و....هتد، بەڵام نزیك ترین و وەرگیراوترین دوعا کە ماوەی نێوان خواو بەندەکانی نزیك دەکاتەوە کاتی کڕنووش بردنە، دەی کەواتە زۆر نزای تێدا بکەن، وەك ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە

فەرموویەتی: ﴿أقرب مايكون العبد من ربّه وهو ساجد، فاكثروا الدعاء﴾.

واتە: نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگارییەوە، کاتی کڕنووش بردنیەتی، کەواتە لە کاتی کڕنووش بردندا زۆر لە خوا بپاڕێنەوە.

هەندێك لەو نزایانەش کە پێغەمبەر (ﷺ) لەکڕنووشدا خوێندوویەتی وەك:

*﴿اللهم اغفرلي ذنبي كلّه دقّه وجلّه وأولّه واخره وعلانيته وسرّه﴾.

واتە: خوایە لەگوناهەکانم خۆش ببە بەبچووك و گەورەی، سەرەتاو کۆتایی ئاشکراو پەنهانی.

* ﴿اللّهمّ اغفرلي ما أسرَرْتُ وما أعلنـتُ﴾.واتـە:خوایـە لەگوناهـەکانم خۆش ببە لەئاشکراو پەنهانی.

پێغەمبـەرمان (ﷺ) ئامۆژگاریمـان دەکـات کـەپاش (تـەحییات) وپێش سەلام دانەوەی نوێژ پەنابگرین بە خوای گەورە لەچوار شت:

﴿ اللهم إني اعوذبك من عذاب جهنم،ومن عـذاب القـبر،ومن فتنـةالمحيا والممات، ومن شر فتنة المسيح الدجال﴾.

واتـە: خوایـە پـەنات پـێ دەگـرم لەسـزای گـۆڕو سـزای دۆزەخ و ئاشوبەی ژیان و مردن و ئاشوبەی چاو سڕاوەی(حـەق داپۆشـەر)، واتـە دەججال.

وە هەروەها ﴿اللهمّ إنّي ظلمتُ نفسي ظلماً كـثيراً، ولايغفـر الـذّنوب الاّ انت، فاغفرلي مغفرة من عندك وارحمني إنّك أنت الغفورُ الرَّحيم﴾.

واتە: خوایە من ستەمم لە نەفـسی خـۆم کـردووە، سـتەمێکی زۆر، کەس نیەلەگوناهو تاوان خۆش بێت، جگـە لـەزاتی تـۆ، سـا خوایـە لێم خۆش ببە بە لێ خۆش بـوونی خـۆت ڕەحمـم پـێ بکـە بەڕاسـتی خـۆت لێبوردەو بەخشندەیت.

بەم نزاو پاڕانەوانەو چەندین نزای تر کـە لـە فەرمودەکانـدا هـاتوون ،دەتوانین چارەسەری ئەو بێ دەنگیەی نوێژ خوێنان بکەین کـە لـەدوای ئیمامەوە دوچاری دەبن پاش ئـەوەی لـە (تـەحییات) ئەبنـەوە، چـونکە

هەندێکیان نازانن چ دوعاو نزایەك بخوێنن، لەبەر ئەوە پیرۆزترین کاتێك بەبێ ئەم نزا بەنرخانە دەبەنە سەر.

## ١٨) گرنگی دان بەویردی دوای نوێژەکان:

چونکە ویردی دوای نوێژەکان کاریگەری زۆری هەیە لەسەر هێشتنەوەی شوێنەواری ملکەچی لەدڵداو ماندەریشە بۆزیاتر لەگەڵ خوادا ژیان لەدوای نوێژەکانیش.

لەبەر ئەوە هەرکەسێك پارێزەری نوێژەکانی بێت و بەجوانترین شێوە ئەنجامیان بدات و، پاشانیش بەزیکرو ویردەکان بیان ڕازێنێتەوە، ئەوە کاریگەریەکی زۆرتر لەسەر نوێژ خوێنەکە دروست دەکەن و وای لێ دەکەن دوای نوێژەکەش دڵە نوورانیەکەی لەگەڵ خوادا بێت، کاتێك نوێژ خوێن لەنوێژەکەی دەبێتەوەو سەلام دەداتەوە، بەسێ جار وتنی (استغفر الله) دەست پێ دەکات، وەك چۆن بڵێی نوێژ خوێن ڕاستەوخۆ دوای سەلام دانەوە داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەکات ئەگەر لەنوێژەکەیدا کەموکورتیەك هەبووبێت.

## دووەم: لابردنی ئەو ڕێگرو بەربەستانەی کەوا دەکەن ملکەچی و دڵسۆزی کەم ببێتەوە:

### ١٩) دوورکەوتنەوە لەو کەرەستەو جێگایانەی کە لەنوێژ بێ ئاگات دەکەن:

عن أنس (رضي الله عنه) قال: كان قرام لعائشة سترت به جانب بيتها، فقال لهاالنبى (ﷺ)﴿ أميطى عني فإنّه لاتزال تصاويره تعرض لي في صلاتي﴾.

واتە: ئەنەس(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: عائیشە بەربەستێکی ڕەنگاو ڕەنگی دانابوو بۆ ئەوەی بیکاتە ستر (بەربەست) ی ماڵەکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دووری بخەرەوە لێم، چونکە بەردەوام لەنوێژەکەمدا سەیری دەکەم و خەیاڵم دەڕوات.

هەر لەم ڕووانگەیەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانمان پێ دەکات کە ئەو شوێنەی نوێژی تێدا دەکەین، باشتێکی سەرنج ڕاکێشی تێدا نەبێت کەخەیاڵمان لای نوێژەکە نەهێڵێت.

لەبەر ئەوە پێویستە ئێمەش لەم سەردەمەدا خۆمان بپارێزین لەنوێژکردن لەو شوێنانەدا کەجێگای هاتووچۆی خەڵك و شوێنی قەرەباڵخن، وەپێویستە لەنزیك دەنگی بێزار کەرو شوێنی گفتوگۆو مەجلیسی گاڵتەو گەپ و، هەموو ئەو کەرەستانەی کەچاو مەشغوڵ دەکەن نوێژ نەکەین.

هەروەها دووركەوتنەوە لەو جێگایانەی كەزۆر گەرمن یان ساردن، ئەگەر بۆمان گونجا باشترە لەو شوێنانەدا نوێژ نەكەین؟ چونكە ئەوەندە ئاگامان لای (گەرم، سارد) ی ئاوو هەواكەیە،سەرئەنجام بێ ئاگامان دەكات لەنوێژەكەمان و ئەمەش ملكەچی ناهێڵێت.

لەو ڕوانگەوە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) فەرمانمان پێ دەكات و دەفەرمێت: ﴿إنّ شدّة الحَرِّ من فيح جهنم، فإذا اشتدَّ ألحرُّ فأبرِدوا عن الصلاة﴾.

واتە: بەهێزی تینی گەرما لەهاڵاوی دۆزەخە، جا ئەگەر گەرمابەتین بوو نوێژەكان بخەنە كاتی فێنكی. ئەبو زەڕ (خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت:كاتێك نوێژمان دەكرد سێبەری گردۆڵكەكانمان دەبینی.

هەر لەوبارەیەوە ئیمامی ئیبنولقەییم(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: نوێژكردن لە گەرمای زۆردا ڕێگرە لە بەملكەچی ئەنجام دانی نوێژەكە، بۆیە نوێژ خوێن نوێژەكە بە ناڕەحەتی و شڵەژاوی ئەنجام دەدات بەهۆی كاریگەری زۆری گەرماكە لەسەری.

لەبەر ئەوە واباشترە كەمێك نوێژەكە دوابخە یت هە تا گە رمیەكە كە م دەبێتەوە، ئەو كات نوێژخوێن بەئارامی و ئامادەیی دڵەوە نوێژەكەی دەكات.

## ٢٠) نوێژ بە پۆشاکێکەوە نەکرێت کە نەخش و نوسراو و وێنەی پێوەبێت و ڕەنگاو ڕەنگ بێت:

﴿عن عائشة {رضي الله عنها} قالت:قام رسول الله (ﷺ) يصلي فى خميصة ذات اعلام، فنظر الى علمها، فلمّا قضى صلاته قال: أذهبوا بهذه الخميصة إلى أبي جهم بن حذيفة وأتوني بأنجبانية، فأنها ألهتني عن صلاتي﴾

واتە: عائیشەی دایکی باوەڕداران(خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرمێت: پێغەمبەری نازدار (ﷺ) هەستا دەستی کرد بەنوێژ لەبەرگێکی چوارگۆشەی خەت خەتدا، لەنوێژەکەیدا سەیری خەتەکانی دەکرد، کاتێك لەنوێژەکەی بوویەوە، فەرمووی: ئەم بەرگە ببە بۆ ئەبووجەهمی کوڕی حوزەیفە و بەرگێکی ئەستووری سادەم بۆ بێنن چونکە لەنوێژەکەمدا خەیاڵی بردم .

هەروەها پێویستە بەپۆشاکێکەوە نوێژنەکەین کەوێنەی پێوەبێت، بەتایبەت وێنەی کەسایەتی و هونەرمەندو یاریزان و وێنەی ئاژەڵان، بەداخەوە ئەم دیاردەیە ئەمڕۆ زۆر بەرچاو دەکەوێت بەتایبەت لەلای هەندێك لاوی دڵگەرم ، کەزۆر جار بەکراسێکەوە نوێژ دەکەن وێنەی یاریزان یان وێنەی کۆمەڵە کەسایەتییەکی دراماو هونەرو فیلمەکانی پێوەیە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی بێ ئاگایی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) یان خۆ لێ بێ خەبەر کردنیان.

**٢١ ) نوێژنەکردن بەئامادەبوونی خواردن:**

لەم بارەوە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ)دەفەرمێت: ﴿لاصلاة بحضرة الطعام﴾.

واتە: لەکاتێکدا خواردن دانرابوو، جارێ نوێژ مەکەن.

چونکە کاتێك خواردنەکە ئامادە کرابوو، ئەگەر پێش نان خواردن نوێژی کرد، ئەوا لەنوێژەکەیدا زیاتر خەیاڵ و بیری لای خواردنەکەیەو هیچ ئامادەییەکی دەروونی و جەستەیی نیە لەنوێژەکەیدا.

لەئەنەسەوە (خوای لێ ڕازی بێت)پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذاقرب العشاء وحضرت الصلاة فابدءوا به قبل أن تصلوا صلاة المغرب، ولاتعجلوا عن عشائكم﴾. واتە: ئەگەر خواردن ئامادە کراو کاتی نوێژ هات، پێش ئەوەی نوێژی شێوان بکەن خواردنەکەتان بخۆن و هیچ پەلەش مەکەن لەخواردندا؟

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿إذا وضع عشاء أحدكم وأقيمت الصلاة فابدءوا بالعشاء ولايجعلن حتى يفرغ منه﴾

.واتە: ئەگەر یەکێکتان شیوی ئێوارەی بۆ دانراو کاتی نوێژیش هاتە پێشەوە، با دەست بە خواردنی شیوەکە بکات و پەلەش نەکات لە خواردندا هەتا تەواو دەبێت، ئینجا نوێژەکەی ئەنجام بدات. !

## ٢٢) نوێژ نەکردن لەکاتی تەنگەتاو بووندا:

گومانی تێدا نیە یەکێکی تر لەو هۆیانەی کە ملکەچی لەنوێژدا ناهێڵن تەنگەتاو بوونی نوێژ خوێنە بە (میز، پیسایی) چونکە تەنگەتاو بوون هۆکارێکی ترە بۆ بێ ئاگابوون لەنوێژەکەو بەهۆیەوە خەیاڵی نوێژ خوێن دەڕوات.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) رێگریشی کردووە لەوەی کەسێك تەنگەتاو بێت و نوێژ بکات. لەبەر ئەوە لەسەر نوێژ خوێن پێویستە بچێت پێویستیەکەی جێ بەجێ بکات و پاشان بەدەست نوێژێکی نوێ و دوور لەتەنگەتاوی و بە دەروونی ئاسودەوە نوێژەکەی بکات، تەنانەت ئەگەر چوون بۆ سەر ئاوەکەی ببێتە هۆی لە دەست چوونی نوێژی کۆمەڵیش.

وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿لاصلاة بحضرة الطعام ولا هو يدافعه الأخبثان﴾.

واتە: نوێژ ناکرێت بە ئامادەبوونی خواردن یان تەنگەتاو بوون بە میزو پیسایی .

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە نوێژکردن بەم حاڵەتەوە ملکەچی ناو نوێژ دەمرێنێت! چونکە نوێژ خوێن ئەوەندە سەرقاڵ بە تەنگەتاویەکەیەوە، تا سەرئەنجام ئاگای لە نوێژەکەی نامێنێت.

## ٢٣ ) نوێژنەکردن لەکاتی خەوهاتندا ( خەوەنوچکە، وەنەوز ):

لــە ئەنەســەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت) پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إذا نعس أحدكم في الصلاة فلينم حتى يعلم ما يقول﴾.

واتە: ئەگەر یەکێکتان لە نوێژدا خەوە نوچکە بردییەوە با ڕاکشێت و کەمێك بنوێت پاشان نوێژ بکات، بابزانێت لەنوێژەکەیدا چی دەڵێت.

کەوابوو پێویستە لەوەها حاڵەتێکدا بابای نوێژ خوێن کەمێك بخەوێت تــا پــشوویەك دەدات ئینجــا هەســتێت نوێژەکــەی بکــات، بــۆ ئــەوەی لەناخەوە ئاگای لەنوێژەکەی بێت و بزانێت کە چی دەڵێت.

لەعائیشەوەپێغەمبەری ئازیزمــان (ﷺ) فەرموویــەتی: ﴿إذانعــس أحدكم في الصلاة فـليرقد حتى يذهب عنه النوم فأن أحدكم اذا صلى وهو ناعس، لعله يذهب يستغفر فيسب نفسه﴾.

واتە: ئەگەر یەکێکتان لەنوێژدا خەوە نوچکە بردیەوە، بــا ڕاکــشێت هەتا خەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەگەر بە خەواڵویی نوێژ بکات لەوانەیە لە جیاتی ئەوەی داوای لێ خۆشبوون بکات قسە بەخۆی بڵێت .

ئەم فەرموودەیە زیاتر مەبەستی شەو نوێژە، چونکە لەشەودا کاتێك هەیــە دوعــای تێدا گیرایــە، ئەگــەر یــەکێك نوێــژ بکــات و خــەوە نوچــکە بیباتــەوە، نازانێت قسە بەخۆی دەڵێت یان داوای لێ خۆشبوون دەکات، خۆ ئەگەر قسەش بەخۆی بڵێت دور نیە گیرابێت، لەبەر ئەوەی کە کاتی گیرابوونی دوعایە،خوای گەورە دێتــە ئاسمــانی دونیــاو دەفــەرمێت: کــێ

داوای لـێ خـۆش بـوون دەکـات یـا لێـی خـۆش بم، کـێ داوا دەکـات یـا وەڵامی بدەمەوە...

### ٢٤) نوێژ نەکردن لە تەنیشت کەسی خەوتـوو یان قسە کەر:

چونکە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ڕێگرییمان لێ دەکات و لـەم بـارەوە دەفەرمێت: ﴿لاتصلوا خلـف الـنائم ولا المتحدث﴾.

واتە: نوێژ لە تەنیشت کەسی خەوتوو و کەسی قسەکەردا مەکەن .

چـونکە قـسە کـەر بەقـسەکردن لـە نوێژەکـە بـێ ئاگـات دەکـات و، خەوتوش دوور نیە خەیاڵت ببات و مەشغوڵت بکات.

لـەم بـارەوە خـەتتابی (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمێت: ﴿أمـا الصلاة إلى المتحدثيـن فقد كرهها الـشافعي و أحمد بـن حـنبـل، وذلـك مـن أجل أن كلامهم يشغل المصلي عـن صلاته﴾.

واتە: نوێـژکردن لەتەنیـشت خـەڵکانی قـسەکەرەوە لەلایـەن ئیمـامی شافیعی و ئیمام ئەحمـەدەوە بـە نابـاش دادەنرێـت، ئـەمەش لەبـەر ئەوەی کە بە قسەکردنیان نوێژ خوێن لە نوێژەکەی بێ ئاگا دەکەن .

بەڵام بەڵگەی نەکردنی نوێژ لەتەنیشت کەسێکی خەوتووەوە هەندێ لـەزانایان بـەلاوازی دادەنێن،هەرچـەندە ئیمـامی بوخـاری لـە صەحیحەکەیدا لە {بەشی نوێژ لەتەنیشت خەوتوو} دا ئـەم فەرموودەیـە دەکاتە بەڵگە کە عائیـشە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمێت: پێغەمبـەر (ﷺ) نوێژی دەکردو منیش لە سەر جێگە خەوتبووم.

بەلاّم لەلای ئیمامی موجاهیدو ئیمامی تاوس و ئیمام مالیك (خوایان لێ ڕازی بێت) نوێـژکردن لەتەنیـشت خـەوتوەوە بـاش نیـە، بـە بەلگـەی ئەوەی کە نەوەك خەوتوەکە بە وڕێنە کردن نوێژ خوێن لەنوێژەکەی بـێ ئاگا بکات، بەلاّم ئەگەر دلّنیابویت لەوەی کە کەسی خەوتوو بێـزارو بـێ ئاگات ناکات لە نوێژەکەت ئەوە قەیدی نیە کە لەتەنیشتیدا نوێژ بکـەیت {والله اعلم}.

## ٢٥) خۆخەریك نەکردن بەتەخت کردنی چەو یان فەرش:

موعەیقیب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: باسـی تـەخت کردنـی چەویان دەکرد لەمزگەوتدا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ئەگـەر چارت نەبوو یەك جار چەوەکە تـەخت بکـە. هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿لاتمسح وأنت تصلي، فان كنت لابد فاعلا فواحدة﴾.

واتە: چەوەکە تـەخت مەکـە لەکاتێکـدا تـۆ نوێـژ دەکـەیت، ئەگـەر چارت نەبوو ئەوا یەك جار تەختی بکە.

ئەمەش بۆ زیاتر پارێزگاری کردنـی ملکەچیە لەنوێـژداو بـۆ ئـەوەی پاداشتی نوێژەکە زۆر بێت، ئەگەر نوێژ خوێن زانی شوێنی سـوجدەکەی پێویستی بە تەخت کردن هەیە باپێش ئەوەی دەست بکاتە نوێژ تەختی بکات؟ چونکە لەکاتی نوێـژدا تـەخت کردنـی شـوێنی لـوت و ناوچـاوان کەراهـەتی هەیـە، ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـوجدەی بـردووەو شوێن سوجدەکەی ئاو یان قوڕ بووەو پاشماوەکەشی بەناوچـاوانیەوە

ماوەتەوە،بێ گومان ئەمەش كاری نەكردووەتە سەر بێ ئاگا كردنی لەنوێژەكە.! چونكە ئەوەندە بە خشوع و تامەزرۆییەوە نوێژەكەی ئەنجام داوە، هەتا سەر ئەنجام ئەم قورپ ئاوەی بیر چوەتەوە هەروەك دەفەرموێت: ﴿إن في الصلاة شغلا﴾.

واتە: لەنوێژدا سەرقاڵ بوون و مەشغوڵی دێتە ڕێت.

هەر لەم بارەوە ئەبو دەرداء (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: لەدەست دانی گەلە وشترێكی سورم لە لا خۆشەویست ترە تاكو لەنوێژدا ناوچاوم بسڕم.

هەروەها عیاز (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: (كرهَ السّلف مسح الجَبْهة في الصلاة قبل الانصراف).

واتە: لای پێشینان كەراهەتی هەیە كە تەوێڵ و ناو چاوت پاك بكەیتەوە پێش ئەوەی لەنوێژەكە ببیتەوە.

كەواتە باشتر وایە كە پاشی سەلام دانەوە لەنوێژ ناو چاوت پاك بكەیتەوە، هەمان كات پێویستە نوێژ خوێن خۆی بپارێزێت لە سەرجەم ئەو جم و جوڵانەی كە لە نوێژەكەی بێ ئاگای دەكەن و، هەروەهاپێویستە ڕەچاوی ئەوە بكات و خۆیشی نەبێتە هۆكاری مەشغوڵ كردنی نوێژ خوێنانی دەورو پشتی.

## ٢٦ ) سەر لێ تێك نەدانی دەوروبەر بەهۆی بەدەنگی بەرز خوێندنی نوێژەكە :

بێ گومان ئەمەش كاریگەری گەورەی هەیە بە ئاراستەی نەهێشتنی خشوعی نوێژەكەی خۆت و كەسانی دەوروپشتت،هەر لەم بارەوە پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿ألا إنّ كلّكم مناجٍ ربه، فلا يؤذين بعضكم بعضا ولايرفع بعضكم على بعض في الصلاة﴾.

واتە: ئێوە هەمووتان لەگەڵ پەروەردگارتاندا گفتوگۆ دەكەن، باهیچ كەسێكتان كەسێكی تر ئازار نەدات، وە دەنگیش بەسەر یەكتردا بەرز مەكەنەوە لەكاتی نوێژكردندا.

هەروەها پێغەمبەری نازدارمان(ﷺ) دەفەرمێت: ﴿لايجهر بعضكم على بعض بالقرآن﴾.

واتە: لەكاتی خوێندنەوەی قورئاندادەنگ بەسەر یەكتریدا بەرز مەكەنەوە.

## ٢٧ ) ئاوڕنەدانەوە لەنوێژدا :

لە ئەبو زەرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿لايزال الله عزّ وجلّ مقبلاً على العبد وهو في صلاته مالم يلتفت، فإذا التفت انصرف عنه﴾.

واتە: بە بەردەوامی خوای گەورە پێشوازی لە بەندەكەی دەكات، كاتێك لە نوێژەكەیدا ئاوڕ ناداتەوە، كە ئاوڕی دایەوە ئیدی خوای گەورە پشتی تێ دەكات.

ئاوڕدانەوە لەنوێژدا دوو جۆرە:

یەکەم: ئاوڕدانەوەی دڵ بۆلای غەیری خوای گەورە.

دووەم: ئاوڕدانەوەی چاو.

هەردووکیان ڕێگرییان لێ کراوەو لەپاداشتی نوێژ کەم دەکەنەوەو، پرسیاریش لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کرا سەبارەت بەئاوڕدانەوە لە نوێژدا فەرمووی: ﴿أختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد﴾.

واتە: ئەوە دزییەکەو شەیتان دەیکات لە نوێژی نوێژ خوێنادا.

نمونەی ئەو کەسەی کە لەنوێژدا بەدڵ یان بەچاو ئاوڕدەداتەوە، وەك نمونەی کەسێك وەهایە کە پاشایەك بانگی بکات، لەبەردەم خۆیدا بیوەستێنێت و پێشوازی لێ بکات و قسەی بۆ بکات، بەڵام لەو کاتەدا کابرا بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕدەداتەوەو ئاگای لەلای قسەکانی پاشا نامێنێت و نازانێت پاشا باسی چی بۆ دەکات، چونکە دڵی لەلای پاشاکە نیەو تەنها بەجەستە لەوێیە.! گومانت بەرامبەر ئەو پیاوە چۆنە کەپاشاکە لەگەڵیدا بکات.؟

ئایا نمونەی ئەو نوێژ خوێنەی کە بێ ئاگایە لەنوێژەکەیی و، نمونەی ئەو نوێژ خوێنەی کە لەناخی دڵەوە تێکەڵ بووە لەگەڵ نوێژەکەیداو بەزەلیلی وەستاوەو فرمێسك لەچاوەکانی هۆن هۆن دێنە خوارێ وەك یەکە؟! بێگومان نەخێر؟ چونکە هاوشێوەکانی نمونەی دووەم دەزانن بەرامبەر کێ دەوەستن و دڵنیاشن کەخوای گەورە لەنوێژەکانیاندا

وەڵامیان دەداتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە ئەم جۆرە کەسانە بەچوونە ناو نوێژ دڵەکانیان ئاو دەخواتەوەو ئارام دەگرن و، چەند ساتێك لەخزمەت پەروەردگاریاندا لەکێشەو گرفتی ئەم دنیا کاتیە دوورن و، زۆر زەلیل و بێ توانا خۆیان بەرامبەر خوا پیشان دەدەن بەئومێدی ئەوەی کە خوا نوێژەکانیان بۆ بکاتە مایەی لێ خۆشبوونی تاوانەکانیان و لەسزای دۆزەخی نەبڕاوە دووریان بخاتەوە.

حەسانی کوڕی عەتیە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: دوو پیاو لە یەك کات و جێگادا هەردووکیان نوێژێکی فەرز ئەنجام دەدەن، جیاوازی نێوان ئەم دوو نوێژە لە گەورەییدا وەك جیاوازی نێوان ئاسمانەکان و زەوییە؟! چونکە یەکەمیان بە ئامادەیی دڵ و دەرون و ڕۆح و جەستەوە نوێژەکەی کردووەو، دووەمیشیان زۆر بە بێ ئاگا نوێژەکەی ئەنجام داوەو تەنها فەرزەکەی لەکۆڵ خۆ کردوەتەوە.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە لەکاتی ناچاری و پێویستیدا ئاوڕدانەوە لەنوێژدا قەیدی نیە {والله أعلم}،لەم بارەوە ئەبو داود لەسەهلی کوڕی حەنزەڵەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەفەرمێت: لەنوێژی بەیانیدا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) نوێژی دەکردو ڕووی وەرگێڕا بەرەو شیوەکە،ئەبو داود دەفەرمێت: ئەو کات بەشەو سوارچاکێکی نارد بۆ شیوەکە {دۆڵەکە} هەتاپاسەوانی بکات. وەئەمەش هەروەك هەڵگرتنی ئەمامەی کچی ئەبی عاص و، هەروەها

کردنەوەی دەرگا بۆ حەزرەتی عائیشە، وە دابەزینی لە مینبەر کەنوێژی بۆ دەکردن تاچۆنیەتی نوێژ کردن فێری هاوەڵان بکات، وە دواکەوتنی لەنوێژی خۆر گیراندا، هەروەها گرتنی شەیتان و خنکاندنی کاتێك ویستی نوێژ بە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) ببڕێت، وە فەرمان دانی بەکوشتنی مارو دووپشك لەنوێژدا، هەروەها ڕێگری کردن لەو کەسەی کە بە بەردەم نوێژەکەتدا تێ پەڕ دەبێت،وەفەرمان کردنی بەئافرەتان کە وەك ئاماژەیەك چەپڵە لێ بدەن لە نوێژدا لەکاتێکدا ئیمام هەڵەو سەهوو بکات لە نوێژەکەیدا، بەڵام ئەگەر ئاوڕدانەوە بۆ پێویستی و حاڵەتی ناچاری نەبێت ئەوا ڕێگری لێ کراوەو کاریگەری هەیە لەسەر نوێژەکەو ملکەچی ناو نوێژ لەناو دەبات.

## ٢٨ ) چاو بەرز نەکردنەوە بۆ ئاسمان لەنوێژدا:

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێ کردووە وەك دەفەرمێت: ﴿إذا كان أحدكم فی الصلاة فلا يرفع بصره الى السماء، أن يلتمع بصره﴾.

واتە: کاتێك یەکێکتان لەناو نوێژدابوو، با ئەوەندە چاوی بۆ ئاسمان بەرز نەکاتەوە کە چاوی ببریسکێتەوە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەچەندین فەرموودەدا ئاماژە بەنادروستی چاو بەرزکردنەوە دەکات لەنوێژدا ، لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە توندی هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە چاو

بـەرەو ئاسمـان بـەرز دەكەنـەوە لـە كـاتی ئەنجامـدانی نوێـژدا وەك دەفەرمێت: ﴿لينتهين أقوام عن رفعهم أبصارهم عند الدعاء في الصلاة إلى السماء، أو لتخطفن أبصارهم﴾.

واتە: ئەو خەڵكانـە يـان دەبێـت واز بهێـنن لەچاو بەرزكردنـەوە بـۆ ئاسمان لەكاتی نوێژدا، يان چاويان دەفرێنرێت، واتە كوێر دەبن.

## ٢٩ ) تف نەكردنە بەردەم لەنوێژدا:

چـونكە ئـەم ڕەفتـارە لەگـەڵ نوێـژ و ڕەوشـتی نوێـژ خوێنـدا يـە ك ناگرێتەوەو ملكەچيش لەنوێژدا ناهێڵێت.

عـن أبـي هريـرة {رضـي الله عنـه} أنّ رَسـول الله (ﷺ) رأى نخامـة فـي قـبلـة الـمسجـد، فأقبل علـى النـاس فقـال: ﴿ما بـال أحـدكـم يقـوم مـستقبل ربـه، فـيـتنـخـع أمـامـه.؟ أيحـب أحدكـم أن يـستقبـل فـيتـنـخـع في وجـه.؟ فـإذا تـنخع أحـدكم فـلـيـتنخـع عـن يـسارة تـحت قدمه، فإن لم يجد فليقل هكذا﴾. {و وصـف الـقـاسم: فـتفل فـي ثوبه، ثم مسح بعضه على بعض}.

واتـە: ئـەبو هـورەيرە (خـوای لێ ڕازی بێـت)دەفـەرمێت: پێغەمبـەر (ﷺ) چاوی كەوت بـە بەڵغـەمێك لەپێـشەوەی مزگەوتـدا فـڕێ درابـوو، ڕوی كـردە خەڵكەكـەو فـەرمووی: چـيتانە وا يـەكێكتان وەسـتاوە ڕوەو پـەروەردگاری و كەچـی بەڵغـەم فـڕێ دەداتـە بـەردەمی خـۆی، ئايـا كەسێكتان پێی خۆشە كاتێك پێشوازی لێ دەكرێت لەو كاتەدا بەڵغەمێك فڕێ بدرێت بەسەروو چاويدا؟ ئەگەر يـەكێكتان بەڵغـەمی فرێدا بابـەلای

چەپداو لەژێر پێیدا ڕۆی بکات، ئەگەر ڕێگاش نەبوو بەم شێوەیە تف بکاتەوە، قاسم دەفەرمێت: شێوازی تف کردنەکەی پێشانداین و تفی کردە سەر سووچێکی جلەکانی و لایەکەی تری دایەوە بەسەریدا.

بەلاَم ئەگەر مزگەوت پڕ فەرش بوو وەك لەم سەردەمەی خۆماندا دەبینین کەمزگەوتەکان بەجوانترین شێوە لەناوەو دەرەوەدا ڕازێنراونەتەوەو، وەك سەردەمانی ڕابردوو نیە کەناو مزگەوتەکان چەو بووە، بەڵکو ئەمڕۆ بەجوانترین و بە بایەخ ترین فەرش مزگەوتەکان پڕ فەرش دەکرێن، لەبەر ئەوە باشتر وایە نوێژخوێن ئەگەر چاری نەبوو با تفەکە بکاتە دەستەسڕێکەوە، چونکە لەم سەردەمەی خۆماندا تف فڕێدانێك لەناو مزگەوتدا دەبێتە هۆی پیس کردنی لانی کەم فەرشێك، لەبەر ئەوە پێویستە زیاتر خۆمان بپارێزین لە تف کردنە ناو مزگەوت ، زانایانی سەردەمی خۆشمان ئەم دیاردە بێزراوە بەکارێکی حەرام و یاساغ دادەنێن.

### ٣٠ ) باوێشك نەدان لەنوێژدا :

عن أبي سعيد الخدري {رضي الله عنه} قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿إذا تثاوب أحدكم في الصلاة فليكظم ما أستطاع، فإن الشيطان يدخل﴾ وفي رواية ﴿فليمسك بيده على فيه، فان الشيطان يدخل﴾.

واتە: ئەبوو سەعیدی خودری(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لەنوێژدا باوێشکیدا، با چەند دەتوانێت خۆی بگرێت و دەمی دابخات، چونکە

شەیتان دەچێتە ناو دەمی، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمێت: با دەستی لەسەر دەمی دابنێت، چونکە شەیتان دەچێتە ناو دەمی.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە شەیتان چووە ناو دەمی هەر کەسێکەوە واتای شپرزە کردن و بێ ئاگاکردنی لەنوێژەکەی دەگەیەنێت، هەروەها لەکاتی باوێشك دانی نوێژ خوێندا شەیتان پێ دەکەنێت.

## ٣١) دەست نەگرتن لەسەرکەلەکە یان ناوك لەنوێژدا:

عن أبي هريرة {رضي الله عنه} عن النبي: ﴿أنه نهى أن يصلي الرّجل مختصرا﴾.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە کە نوێژ خوێن دەست بخاتە سەرناوکی یان کەلەکەی لەنوێژدا.

زیادی کوڕی سوبیح (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: لە تەنیشت عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژم دەکردو دەستم خستە کەلەکەم و ئەویش کێشای بەدەستمدا، پاش نوێژەکە پێم وت بۆ وات کرد؟ فەرمووی ئەوە لەخاچ دانی نوێژە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێ کردووە.

## ٣٢ ) جل شۆڕ نەکردنەوە لەنوێژدا :

لەفەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە لەجل شۆڕکردنەوە لەنوێژدا. خەتتابی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: {السدل} واتە: شۆڕکردن و بەردانەوەی جل و بەرگ هەتاکو دەگاتە سەرزەوی.

وە لە {مرقاةُ المفاتیح} ەوە وەرگیراوە کە {السدل} بە تەواوی نەهی لێ کراوە، لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی لەخۆبایی بوون، وە هەروەها ناشرین و ناپەسەندە و لەگەڵ ڕەوشتی نوێژخوێندا ناگونجێت.

هەروەها دەوترێت {السدل} دانانی قوماشێکە بەسەر سەردا یان بەسەر شانداو شۆڕ بوونەوەی بەم لاو بەولاداو، یان شۆڕ کردنەوەیەتی بەسەر هەردوو قۆڵداو بەردەوام خۆخەریك کردن بەڕێك کردنی، ئەمەش ملکەچی و خشوع کەم دەکاتەوە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر جل و بەرگ گورج و گۆڵ بوو، نوێژ خوێن سەرقاڵ ناکات بەڕێك کردنی جل و بەرگەوە.

هەروەها سەبارەت بە {السدل} هەندێك دەڵێن کە لەپیشەی جولەکەکانە.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە هۆکاری ڕێگری کردن لەجل شۆڕکردنەوە لەنوێژدا ئەوەیە کەجل شۆڕکردنەوە نوێژ خوێنەکە خەریك دەکات بە هەڵکردن و گرتنی جلەکانیەوە لەکاتی ئەنجام دانی کردارە

جیاوازەکانی نوێـژدا، لەبـەر ئـەوە پێویـستە موسـڵمانان لـەکاتی نوێـژ کردندا لەم خوە نا پەسەندە خۆیان بپارێزن.

## ٣٣) وازهێنان لەخۆ چوواندن بە ئاژەڵ لەنوێژدا:

خوای گەورە ڕێزی لە بەنی ئادەم گرتووەو لەسەر جـوانترین شـێوە دروسـتی کـردوەو هـەمان کـات فەزڵیـشی داوە بەسـەر هـەموو دروسـت کراوەکـانی تـردا، لەبـەر ئـەوە ناگونجێـت و ناشـیرینە کـە مـرۆڤ خـۆی بـشوبهێنێت بـە ئـاژەڵ، وە ڕێگریمـان لـێ کـراوە کـە لەنوێـژدا خۆمـان بچوێنیـن بـە ئـاژەڵ لـە هـەندێك لـە جوڵـەکانی نوێـژدا، چـونکە ئـەم هەڵسوکەوتە نـاشیرینانە کاریگەری خراپیان دەبێت لەسـەر بەرجەسـتە کردنـی ملکەچـی لەنوێـژدا، وەلەگـەڵ ڕەوشـتی نوێـژو نوێژکردنـدا یـەك ناگرێتەوە.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە: ﴿نهـی رسـول الله (ﷺ) في الـصلاة عـن ثلاث: عن نقر الغراب، وأفتــراش السبع، و أن يوطن الرجل المقام الواحـد كإيطان البعيــــر﴾.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لەسێ جۆر نوێـژکردن کـردووە: نوێـژکردن وەك چـۆن قەلـەڕەش دەنـووك دەدات لـەزەوی، دانیـشتن و کەوتن وەك دڕندە، مانەوە لە یەك شوێندا بۆ ئەنجام دانی چەند نوێـژێك وەك چۆن حوشتر لەیەك شوێندا دەمێنێتەوەو شوێنی خۆی ناگۆڕێت.

یـەکێك لـەهاوەڵان دەفـەرمێت: (نهـاني عــن نقــرة كنقـرة الـديك، وأقـعـاء كـــإقعـاء الكلب، والتفات كالتفات الثعلـب). واتـە: پێغەمبـەری ئـازیز (ﷺ) ڕێگـری لێ کـردم لـە نوێـژی بەپەلـە، وەك چـۆن کەڵەشـێر دەنووك لەزەوی دەدات، وە هاتنە سەرچیکان لەنوێژدا وەك چۆن سـەگ دێتـە سـەر چـیکان، وەئاوڕدانـەوە لەنوێـژدا وەك چـۆن ڕێـوی ئـاوڕ دەداتەوە.

## ٣٤ ) لێدانی زەنگی مۆبایل لەنوێژدا :

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، نوێژکردن واتای وتو وێژو گفتوگۆیـە لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا، لەبـەر ئـەوە پێویـستە مرۆڤـی موسـڵمان لەکاتی ئەنجام دانی نوێژەکانیدا خۆی لەهەموو خەیاڵ و بیرکردنەوەیەك بپارێزێت، بەتـەواوەتی ئاگـای لـە نوێژەکـەی بێـت، وە پێویـستە ڕێگـە بەهیچ شتێك نەدات کە ببێتە هۆی دابڕینـی نوێـژ خـوێن لەنوێژەکـەیی و مراندنی ملکەچی لەنوێژدا، لێدانی زەنگی مۆبایل لەکاتی نوێژکردنـدا کـە ئەمــەش کاریگەرییــەکی زۆری هەیــە لەســەرکەم کردنــەوەی ملکەچــی لەنوێژدا، چونکە تۆ کاتێك کـە بـیرو هۆشـت لـەلای نوێژەکـەت نامێنێـت ئەوە تـەنها زیانی بۆ نوێژەکەی خۆت هەیە، بەڵام لێدانی زەنگی مۆبایـل لەکاتی نوێژو لەمزگەوتدا هۆکارێکـە بـۆ بـێ ئاگـا کردنـی خـەڵکێکی زۆر لەنوێژەکەی ،هەمان کات دەبێتـە هـۆی نەهێـشتنی ملکەچـی لەنوێـژدا،

بەلاّم بەداخەوە نوێژ خوێنان زۆر ئەم حالّەتەیان پشت گوێ خستووەو لەكاتی نوێژدا مۆبایلەكانیان بێ دەنگ ناكەن.

ئەو خالاّنەی كەخستماننە ڕوو چەندهۆكارێكی گرنگ بوون بە جێ بەجێ كردنیان ملكەچی و خشوع لەنوێژدا بەرجەستە دەبێت.

- لەگرنگترین بابەتی ملكەچی و بەرز نرخاندنی لەلای زانایان ، گفتووگۆو موناقەشەیان لەسەر ئەمانەی خوارەوە كردووە:

- كێشەی زۆری دوو دڵی وگومان و واسواسی، ئایا ئەو نوێژە تەواوە یان دەبێت دوبارە بكرێتەوە؟لەم بارەوە ئیبنو عەبباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: ئەو نوێژەت تەواو نیە جگە لەوەی كە ئاگات لێی بووە. وە لەفەرموودەیەكی مەرفوعدا هاتووە: نوێژ خوێن كاتێك نوێژدەكات، هەیە نیوەی پاداشتی بۆ دەنوسرێت ،هەیە سێ یەكی پاداشتی بۆ دەنوسرێت، وە هەیە چواریەك و هەتا دەگاتە دە پاداشت لە نوێژەكەدا.

- پێویستە ئامـاژە بەوە بدەین كە خوای گەورە سەرفرازی و سەركەوتوویی نوێژخوێنان دەبەستێتەوە بەخشوع و ملكەچی لەنوێژدا، ئەمەش مانای وەهایە هەركەسێك خشوع لەنوێژەكەیدا نەبێت لەكۆمەڵی سەرفرازبووەكان نیە.

ئەو نوێژەی کەخشوع و ملکەچی تێدا نیەو نوێژ خوێن دڵـی لـەلای نوێژەکەی نیە، کۆمەڵی زانایـان لـەم بـارەوە بـیرو بۆچـونیان جیـاوازە سەبارەت بە دوبارە کردنەوەی نوێژەکـە یـان دوبـارە نەکردنـەوەی، وە دوو بۆچوون هەیە لەو بارەیەوە، کە ڕاوبۆچوونیان جیاوازە لە پێویستی دووبارە کردنەوەی ئەو نوێژەی کە واسواسی و دوو دڵی تێدایـە، ئیبـنو حامید کە لەهاوەڵانی ئیمامی ئەحمەدە ،بەواجیب و پێویـستی دەزانێـت کەنوێژەکە دوبارە بکرێتەوە.

بەڵام زۆربەی زانایان و فوقەهاکانی ئەم ئوممەتە بەواجبی نازانن کە لـەم حاڵەتـەدا نوێـژ دوبـارە بکرێتـەوە، وە بـە بەڵگـەی ئـەوەش بۆچـوونەکەیان بـەهێز دەکـەن کـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەگـەر سـەهوی کردبێـت لەنوێـژدا سـوجدەی سـەهوی بـردووەو فـەرمانی نـەکردووە بەدووبارە کردنەوەی نوێژەکە وەك دەفەرموێت:

﴿إن الشيطان يأتى أحدكم فى الصلاة فيقول: اذكر كذا وكذا، لمـا لم يكن يذكر، حتى يضل الرجل أن يـدرى كـم صـلـى﴾.

واتە: شەیتان لەنوێـژی کەسـێکتاندا دێـت و دەڵێـت ئـاوا بکـەو ئـاوا بکـە، هـەتا وای لـێ دەکـات ئـەو کەسـە نـەزانێت چـەند ڕکـات نوێـژی کردووە.

وەگومان لەوەدا نیە كە ئەو نوێژە هیچ پاداشتی تێدانیە، بێجگە لەو بەشەی نەبێت كە ئاگای لێی بووەو ملكەچی تێدا نواندوە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

﴿إن العبد لينصرف من صلاة ولم يكتب له الإنصفها، ثلثها، ربعها، حتى بلغ عشرها﴾. واتە: بەندە كاتێك نوێژ دەكات هەیە نیوەی پاداشتی بۆ دەنوسرێت، هەیە سێ یەكی پاداشتی بۆ دەنوسرێت، وە هەیە چواریەك تا دەگاتە دە یەكی پاداشت لەنوێژدا..

ئیبنو عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: لەنوێژدا بێجگە لەوەی كە ئاگات لێی بووە پاداشتێكت بۆ نیە.

# کۆتایی

ملکەچی و خشوع لەنوێژدا گرنگیەکی زۆری پێدراوە، هەرکەس بەملکەچیەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات ئەوا سەرفرازی هەردوو جیهان دەبێت، ئەوەش پشت گوێی بخات ئەوا خۆی دووچاری کارەساتێکی گەورەو ترسناك کردووە، هەر لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمێت: ﴿اللهم إني أعوذ بك من قلب لايخشع......﴾. واتە: خوایە پەنات پێ دەگرم لەدڵێك کە خاڵیە لە ترس و ملکەچی بۆ تۆ.

پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین کە ملکەچ بوونی نوێژیش چەندین پلەن، وەملکەچی لەناخی دڵەوە دێت، زۆرو کەم دەکات، جاری وەها هەیە ملکەچی لەنوێژدا دەگاتە ئاستی ئاسمان، وەجاری وەهاش هەیە نوێژکەر نوێژەکەی دەکات و هەست بەهیچ ئارامیەك ناکات و چێژ لەنوێژەکەی وەرناگرێت، پێویستە ئامارژە بەوەش بدەین نوێژخوێنان لەرووی چۆنیەتی ئەنجام دانی نوێژەوە دەکرێن بەپێنج بەشەوە:

یەکەم: لەڕادەبەدەر ستەم لەنەفسی خۆی دەکات لەنوێژەکەیدا، ئەم کەسە کەمتەرخەمە لەدەست نوێژگرتن و ئەنجام دانی نوێژەکەو کەمتەرخەمی کردن لەسنورو پایەکانی نوێژەکەیدا.

دووەم: ئەو كەسەی كە پارێزگاری دەكات لە نوێژەكەی،هەروەها لەكاتی ئەنجام دانی نوێژەكەو، وەسنورو پایەكانی و دەست نوێژگرتن بەجوانی دەپارێزێت، بەڵام توانای بەرەنگاری بوونەوەی دەروونی نیەو ناتوانێت خۆی لەدوودڵی و گومان بپارێزێت، بەوشێوەیە لەنوێژەكەیدا سەرقاڵی خەیاڵ و دوودڵی و بیركردنەوەیە.

سێ یەم: ئەو كەسەی پارێزگاری لەسنورو پایەكانی نوێژ دەكات و بەرەنگاری دەروونی خۆی دەبێتەوەو لە دوودڵی و گومان خۆی دەپارێزێت و، لەناو نوێژەكەیدا سەرگەرمە بەدژایەتی كردنی دوژمنەكەی تا نەتوانێت نوێژەكەی بدزێت.

چوارەم: ئەو كەسەی نوێژەكەی بەجوانی ئەنجام دەدات، لەڕووی پارێزگاری لەجوان ئەنجام دانی و پارێزگاری لەپایەو سنورەكانی، هاوشێوەی ئەم جۆرە كەسە بەردەوام دڵی ڕۆچووە لەناو زیكرو یادی پەروەردگارداو لەهەموو سنوورەكانەوە پارێزگاری لەنوێژەكەی دەكات، تا شەیتان لەهیچ شوێنێكەوە نەتوانێت زیانی پێ بگەیەنێت، بگرە هەموو خەمێكی ئەوەیە كەنوێژەكەی بەجوانترین و چاكترین شێوەو لەكاتی خۆیدا ئەنجام بدات و، تەنها سەرقاڵی وتو وێژە لەگەڵ خوای گەورەداو بەس.

پێنجەم: ئەو كەسەیە نوێژەكەی زۆر بەجوانی و ڕێك و پێكی ئەنجام دەدات و لەهەمان كاتدا زۆر بەزەلیلی و بەدڵێكی پڕ لەگریانەوە لەبەردەم خوای خۆیدا وەستاوەو، واهەست دەكات كە خوای گەورە دەبینێت، بەچاودێری دەزانێت لەسەرخۆیی و تێرنابێت لەخۆش ویستنی خوای گەورە؟ چونكە واهەست دەكات كە لەنوێژەكەیدا خوا دەبینێت، خۆ ئەگەر ئەم خوا نەبینێت ئەوا بێگومان خوای گەورە ئەم دەبینێت، كە ئەمەش بەرزترین پلەی ئیمانە،بەڵی بێ گومان (أحسان) بەرزترین پلەی ئیمانە كە بەندە چاكەكانی خوا پێی دەگەن و ئەمەش گەورەترین و بەرزترین ئاستی نزیك بوونەوەیە لەخوا،بێ گومان ئەگەر بەم شێوازە نوێژمان ئەنجامدا، ئەوا بچووكترین دوودڵی و بیركردنەوە زەفەرمان پێ نابات و ناتوانێت دڵ و چاومان لەخوا بێ ئاگا بكات؟ چونكە ئەو جۆرە نوێژ خوێنانە دەزانن كە ئێستا كاتی گفتووگۆو موناجاتە لەگەڵ خوادا، نەك كاتی بیركردنەوە لەسەروەت و سامان و خزم و كەس و كارو كێشەو نەهامەتیەكانی دونیا.

## بابزانین ئەم پێنج پلە پاداشتیان جیاوازە:

پلـــەی یەكـــەم ســـزای لەســـەرە، پلـــەی دووەم لێپرســـینەوەو لێپێچینەوەی لەگەڵ دەكرێت، پلـەی سێ یـەمیش دەبێتـە مایـەی لـێ خۆشبوونی تاوانەكانی و، پلەی چـوارەمیش پاداشـتی بـۆ هەیـە، پلـەی پێنجەمیش لەپەروەردگاری نزیـك دەبێتـەوە؟ چـونكە ئـەم جـۆرە نوێـژ خوێنانە ڕوناكی چاوانیان لەنوێژەكانیاندایە، هەركەسێك لەدونیادا چاوی بەنوێژەكەی شادومان بێـت، ئـەوا بـێ گومـان لـەڕۆژی دوایـی دا بـەنزیك بوونی لەپـەروەردگارەوە چاوی شـادومان تـر دەبێـت، هـەروەها ژیـانی دونیاشـی بـۆ ئاسـان دەكرێـت بەیارمـەتی خـوای پـەروەردگار بەسـەر كۆسپو كێشەكانی ژیانی دونیادا سەردەكەوێت، بەو شێوەیە شادومانی دەبێتـە بەشـی ئـەو كەسـانەی كـەخۆیان لەپلـە پێنجـی نوێـژ خوێنانـدا دەبیننەوە، هەرچاوێك بەخوا شادومان بێت ئـەو چـاوە بـەئاگری دۆزەخ ناسوتێت و هەرچاوێكیش شادومان نەبێت بەدیداری خوای گـەورە، ئـەوا سەرەنجام خوای گەورە دەروونی ئەو كەسە تـەرخان دەكـات تـەنها بـۆ كێشەو نەهامەتی ئەم دونیا كاتیە.

لەكۆتایی دا داوا لەخوای گەورە دەكەین یارمەتیمان بدات هەتا بەخشوع و ملكەچیەكی تەواوەوە نوێژەكانمان ئەنجام بدەین و سەرفرازو عاقیبەت خێرمان بكات.

هەروەها پێمان باش بوو وەك پاشكۆیەك پوختەی تەفسیری سورەتی {الفاتحة} و چەند سورەتێكی كورت و بە كوردی كردنی {تەحییات} و چەند ویردێكی كردارە جیاوازەكانی نوێژ بۆ نوێژخوێنە بەرێزەكان بەزمانی شیرینی كوردی بخەینە ڕوو:

سورەتی {الفاتحة}

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿(١) ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٢) ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (٣) مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (٧)﴾

١ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ٢ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان ٣ ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی میهرەبان ٤ ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە ٥ ﴿إِيَّاكَ

نَعۡبُدُ﴾ خوایە بەتەنها تۆ دەپەرستین ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ وەتەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەكەین ٦ ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ڕێنمونیمان بكە بۆ ڕێگای ڕاست ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ڕێگای ئەوانەی كە چاكەت لەگەڵ كردوون ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ نەك ڕێی ئەوانەی خەشمی تۆیان لێ گیراوە ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ نەك ڕێی گومڕایان.

سورەتی {الإخلاص}

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿٣﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾﴾

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ١ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بڵێ ئەوە خوای تاك و تەنیایە ٢ ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ ئەو خوایەی بێ نیازو جێی نیازو ئومێدە ٣ ﴿لَمۡ يَلِدۡ﴾ كەسی لێ نەبووە ﴿وَلَمۡ يُولَدۡ﴾ وەلە كەسیش نەبووە ٤ ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾ وەهەرگیز هیچ كەس هاوشێوەو هاوتای نیە.

سورەتی {الفلق}

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾﴾.

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ١ ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ ئەی محمد بلّێ پەنا دەگرم بەدروست كەری بوونەوەر "بەرەبەیان"، ٢ ﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ لەزیانی ئەوەی كەدروستی كردووە ٣ ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ لەزیانی تاریكی كاتێك كە دادێت ٤ ﴿وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ﴾ وەلە زیانی فووكەران جادووكەران بە گرێیانداه ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ وەلە زیانی بەخیل و حەسود كاتێك كە حەسودی ببات.

سورەتی {الناس}

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ (١) مَلِكِ النَّاسِ (٢) إِلَٰهِ النَّاسِ (٣) مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤) الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ (٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ (٦)﴾

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ١ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ ئەی محمد بڵێ پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی ٢ ﴿مَلِكِ النَّاسِ﴾ پاشای خەڵکی ٣ ﴿إِلَٰهِ النَّاسِ﴾ پەرستراوی خەڵکی ٤ ﴿مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ﴾ لەزیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهان کەر ٥ ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ﴾ ئەوەی کە وەسوەسە دەخاتە دڵی خەڵکی ٦ ﴿مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ﴾ لەجنۆکەو ئادەمیزاد.

نزای چەمینەوەکان: {سبحان ربّي العظيم} واتە: پاکی و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری مەزنە.

نزای هەستانەوە لەچەمینەوەکان: {سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد} واتە: خوای گەورە ستایشی ئەو کەسەی بیست کە ستایش و سوپاس و پێزانینی بۆ دەربڕیوە، پەروەردگارمان ستایش بۆ تۆیە.

نزای کڕنووشەکان: {سبحان ربي الأعلى}

واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری زۆر بەرزم.

نزای دانیشتنی نێوان دوو کڕنووشەکە: {رب اغفرلي، رب اغفرلي} واتە: پەروەردگارم لێم خۆش ببە، پەروەردگارم لێم خۆش ببە.

## {تەحییات}

﴿التَّحِيَّاتُ لِله والصّلوات والطيبات﴾ موڵك و مانەوەو گەورەیی و درودو پاڕانەوەو لالآنەوەو وشەی چاك و پاك هەر بۆ خوایە، ﴿السّلام عليك ايها النّبي ورحمة الله وبركاته﴾، سلاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەربێت ئەی پێغەمبەری خوا،

﴿السّلام علينا وعلى عباد الله الصّالحين﴾ سلاو لە ئێمە و لە هەموو بەندە چاکەکانی خوای گەورەش بێت، ﴿اشهد ان لاّ إله الاّ

الله. وأشهدُ أنّ محمّداً عبدهُ ورسولهُ﴾ شايەتی دەدەم هيچ پەرستراوێك نيە بەهەق جگە لەزاتی {الله} وە شايەتی دەدەم كە {محمد} بەندەو نێردراوی خوايە،

﴿اللهم صلِّ على محمّد وعلى آلِ محمّد كما صلّيت على ابراهيم وعلى آلِ ابراهيم انّك حميد مجيد﴾ خوايە سەلاوات و ڕەحمەت بڕێژە بەسەر {محمد} و خانەوادەو كەس و كاری {محمد}دا، هەروەك درودت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و كەس و كاری ئیبراهیمدا، بەڕاستی تۆ سوپاس كراوو بەڕێزيت، ﴿اللهمّ بارك على محمّد وعلى آلِ محمّد، كما باركت على ابراهيم وعلى آلِ ابراهيم انّك حميدٌ مّجيد﴾. خوايە فەڕو پيرۆزی بڕژە بەسەر{محمد} و كەس و كاری{محمد} دا، هەروەك فەڕو پيرۆزيت ڕژاندووە بەسەر ئیبراهیم و كەس و كارەكەيدا، بەڕاستی تۆ سوپاس كراوو بەڕێزو خاوەن شكۆيت.

**سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اشهد ان لااله الا انت استغفرك واتوب اليك، وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه الاخيار**

# کۆتایی

**بەیارمەتی خوای گەورە لە ٢٠-١-٢٠٠٩ دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە،سوپاس بۆ پەروەردگار لە ١٠-٢-٢٠٠٩ کۆتایی بە وەرگێڕانەکەم هات؟!**


## ناونیشانی وەرگێڕ

karwanrasheed@yahoo.com

**ژمارەی مۆبایل : ٠٧٥٠١١١٦٣١٨**

# ناوەڕۆك